# زماننـاسیی دیکارتی

## بەشێك لە مێژووی بیرکردنەوەی ئەقڵگەرا

MUKIRYANI
ESTABLISHMENT FOR RESEARCH & PUBLICATION

٢٠١٣

**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

- **زمانناسیی دیکارتی**
- زمانناسیی دیکارتی / نوام چۆمسکی
- وەرگێڕانی بۆ کوردی: مستەفا غەفوور
- نەخشەسازی ناوەوە: ڕێدار جەعفەر
- بەرگ: ڕێمان
- نرخ (٤٠٠٠) دینار
- **چاپی یەکەم : ٢٠١٣**
- **تیراژ: (١٠٠٠) دانە**
- **چاپخانە: موکریانی (هەولێر)**
- **لەبەڕێوەبەراتیی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٢٧١٣) ساڵی (٢٠١٣)ی پێ دراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٧٨٥)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

## ناوەرۆك

# بەرچاوڕوونی

خوێنەری بەرێز...  بەندە لەلایەك بڕوام بەوە نییە لە ژێر ناوی پێشەکی، هیچ شتێك بۆ هیچ بەرهەمێکی وەرگێردراو بنوسرێ، لە لایەکی تر لەوە بچوکترم پێشەکی بۆ بەرهەمی نووسەرێك بنووسم، کە ئەستێرەیەکی پرشنگداری بواری زانستیی زمانە و خاوەنی خەلاتی نۆبلێ. ترسی بە گژداچوونی بابەتێکی قووڵ و ئالۆزی زمان، کە پتر دەکەوێتە خانەی فەلسەفەی زمان، هۆگریم بۆ گرینگی بابەتەکە، لە نێوان ترس و هۆگری دا رایانگرتم، لەبەرئەوە ناچار بووم بە ریسك کردن مل لەوەرگێڕانی ئەم بابەتە بنێم، سەرەڕای وەرگێڕاوە فارسییەکە دەقە ئینگلیزییەکەشم دەستەبەر کرد. داوام لە مامۆستای بەڕێز دکتۆر رەفیق شوانی کرد یارمەتیم بدات، ناوبراویش بە دڵفراوانییەوە پەسندی کرد و رێنوێنییەکی باشی کردم کە لە دڵەوە سوپاسی دەکەم. دیارە میکانیزمی وەرگێڕانی بابەتێکی ئاوا گرفتی زۆرە، هەر لە ساغکردنەوەی زاراوەکان و خۆشکردنی بابەتەکە و روونکردنەوەی ئالۆزییەکان و ئالوگۆڕی پەراوێزەکان و... کە هەریەکیان ئەزموونی تایبەت بەخۆی گەرەکە، ئەگەر ساغکردنەوەی زاراوەکەش ئاسان بێ ئەوا جێکردنەوەی لە رستەیەکی بێ گرێوگۆڵدا رەنگە ئاسان نەبێ، ئەگەر رەوانیی و جوانکاریی رستەسازییەکەش ئاسان بێ دوور نییە مەبەست یا مانای پڕ بە رستەکە نەگەیەنێ. بە کورتی ناچار بووم هەر رستەیەکی وەرگێڕاوە فارسییەکە لەگەڵ دەقە ئینگلیزییەکە بەراورد بکەمەوە. دواتر بینیم زۆربەی زاراوەکانی زمانەوانی، هێشتا نە نووسەران تەنانەت خودی شارەزایانیش لەسەری ساغ نەبوونەتەوە، ئیتر لەبەر ئەوە بێ کە رێنوێنییەکانی کۆڕی زانیاری کورد لە ئارادا نیین و ئەو جۆگەلەیە وشکی کردووە، یا کەس خەتی کەس ناخوێنێتەوە، یا وشە و

زاراوەسازی بە گەشەکردنی ئەمڕۆی زمانی کوردی راناگا، یا...، کە ئەمە خۆی بابەتێکی جیایە و ئێرە جێگای باسکردنی نییە. بۆیە لەگەڵ بۆڵت یا تۆخکردنی هەر زاراوەیەك، زاراوە ئینگلیزیەکەشم خستە پەراوێزەوە، دواتر بۆ ئەوەی زەحمەتی خوێنەر کەم بکەمەوە پەراوێزەکانی پاشکۆی دەقەکەم بە جیا خستە پەراوێزی لاپەرەکانی بەردەم بابەتەکان.

ئیتر بە سوپاسەوە چاوەڕوانی رەخنەکانتانم...

**مستەفا غەفوور**

# پێش وتە

مەبەستی ئەم زنجیرە بەرهەمە، کە ئەم کتێبە یەکەمیانە، ڕۆچوونە بە چۆنییەتی زمان، پرۆسەکانی زمان و پێکهاتەی زەینیی زماندا، کە زەمینە خۆشکەری فێربوون و کەڵك وەرگرتنە لە زمان. گوایە پرسی تاوتویّ کردنی زمان، زانستی ئێمە لەمەڕ دەروونناسی مرۆڤدا قووڵتر دەکاتەوە، باوەڕێکی نویّ نییە. ئەوە روونە کە کاتی کەڵك وەرگرتن لە زمانی ڕۆژانە، باڵاترین تواناکانی زەین دەکەونە گەڕ. بە سەرنجدانە ئەم بەهرەیە و تایبەت بوونی بە مرۆڤ، ئاساییە وا بیربکەینەوە کە تاوتویّ کردنی زمان، زانیاریمان لەبارەی چییەتی مێشك و چۆنییەتی کارکردنی زمان پتر دەکات.

زمانناسی نویّ، زانیاری جوان و فراوانی لە مەڕ پانتاییەکی بەربڵاوی جۆرەها زمان داوە بەدەستەوە و، هەوڵی داوە بە بەراورد لەگەڵ لێکۆڵینەوەکانی پێشووتری زمان، روونکردنەوە و دڵنیاییەکی پتر دەستەبەر بکات و، لەم ڕێڕەوەشدا سەرکەوتوو بووە. هاوکات پەیوەندیەکی بەردەوامی بە پرسە تیۆرییەکانەوە هەبووە، کە بۆتە بەهۆی روونکردنەوەی بنەماکانی زمانناسی. لە ئاکامی ئەم پێشکەوتنەی زمانناسی دا، ئەم پرسیارە بنەڕەتییە، کە چۆن ئەزموون و پرسەکانی پەرەسەندنی زمان، ئاوێتەی یەکتر دەبن و، لە چوارچێوەی توانا سنووردارەکانی مرۆڤ، دەگەنە توانای زمانی ئاخاوتنی ئاسایی، شایانی خستنە روو و تاوتویّ کردنە. کەواتە ناواقعییانە نییە ئەگەر هیوادار بین ئەم لێکۆڵینەوانەی ئێستا دەخرێنە بەردەست، روونکردنەوەیەکی بەجیّ و راست و رەوانی تواناکانی زەینی بدەن بەدەستەوە، کە زەمینە خۆشکەری توانای زمانیین. ئەوەندەی ئاوازی تایبەتی باڵندەکان، خووی بەربەست دروستکردنی سەگلاوْك و هەمئاهەنگی رەفتاری

مێشەنگوینەکان لەگەڵ یەکتر، لە سیستمێکی چالاکی هەرەوەزی ناو کندودا، ئەو توانا زمانییانەش هێندەی ئەوانە تایبەتمەند و جۆری تایبەتن بە مرۆڤ.
پێوەری هەڵبژاردنی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە لەم زنجیرە بەرهەمەدا لەبەرچاو گیراون، ئەمەیە: بتوانین ئەو پرسیارە سەرەکیانەی سەرەوە روون بکەینەوە. ئێمە لە هەڵبژاردنی بەرهەمە تیۆری و وصفییەکانی سەرەوە، لە خۆمان دەپرسین، ئایا ئەو زانیارییە زمانییانەی لە ژێر لێکۆڵینەوەن، یارمەتیمان دەدات بۆ پەیبردن بە ژێربینای زمان؟ ئایا ئەم پێکهاتە زمانیانە، زانیاریمان لەمەڕ خەسڵەتە گشتییەکانی زمانی مرۆڤ پتر دەکات؟ ئایا ئەم خەسڵەتە گشتییانەی زمانی مرۆڤ، رێنوێنیمان دەکات بۆ گەیشتن بە زانیاری ئەوتۆ لەمەڕ چییەتی ئەو ئۆرگانیزمەی کە دەتوانێ زمان فێربێ و بەکاری بهێنێ؟ هەر ئەم تێبینیانە رینوێنیمان دەکەن لە هەڵبژاردنی لێکۆڵینەوی مێژویی و بنەرەتییەکان دا. لەمەڕ بابەتی لێکۆلینەوە هێچ سنوورێکی دیاری کراو بوونی نییە، چونکە ئامانجی سەرەکی ئێمە ئەمەیە، کە بیرکردنەوە نەریتی و نوێیەکان لەمەر پرسی زمان بە تەواوی بخرێنە روو.
لە روانگەی بابەتی توێژینەوە، ئەو لێکۆڵینەوانەی بڕیارە لەم کۆمەڵەدا بگونجێنرێن، دەکرێ دابەش بکرێن بۆ سێ بەش:
١- ئەو لێکۆڵینەوانەی راستەوخۆ لە چییەتی زمان دەدوێن.
٢- ئەو لێکۆڵنەوانەی پەیوەستن بە کارایی زمان و تواناکان و رێکخستنی مێشك پێویستی پێشوەختی ئەمکاراییەیە.
٣- ئەو لێکۆڵینەوانەی پەیوەستن بە پێشینەی لێکۆڵینەوە زمانییەکان، کە چەند بۆچوونی جیاواز لە لێکۆڵینەوە زمانییەکاندا لە شوێنی گونجاوی مێژوویی و فکری خۆی دادەنێ.

لەبارەی **گروپی یەکەم**، دەمانەوێ چەند لێکۆڵینەوەیك بخەینە روو، کە پەیوەندییان هەیە بە لایەنە تایبەتەکانی چەند زمانێکی دیاری کراو. ئەم لیچکۆڵینەوانە ، باسی نەحو، واتاناسی و مۆرفۆلۆجی چەند زمانی جۆراوجۆر و رێرەوی گۆرانکارییەکانیان دەگرێتەوە. لەتەك ئەمانەشدا هیوامان وایە چەند تاوتوێکردنێك لە بارەی بنەمای تیۆری لێکۆڵینەوەی وصفی بلاو بکەینەوە. دیسانەوە لێرەدا دەمانەوێ لێکولینەوەی دەستووری، واتاناسی، مۆرفۆلۆجی و پرۆسەکانی و بەڵگەکانی دیاردەی سەیری گۆڕانکاری زمانی بخەینە روو، کە تا یەك نەوە پێشتر بابەتی سەرەکی لێکۆڵڵینەوە زمانییەکان بوو. لە کۆتایی دا بەشی ئەم کۆمەڵەدا، چەند کتێبێك چاپ دەکرێن لەمەڕ لایەنە رووکارییەکانی زمان، کە بە شێوازی ماتماتیکی تاوتوێ کراون.

**گروپی دووەم،** بە گشتی ئەو لێکۆڵینەوانە دەگرێتەوە لە بواری دەروونناسی زمان دان. مەبەستی ئێمە ئەمەیە، کە ئەو لێکۆڵینەوانی پەیوەستن بە مۆدێلەکانی کارایی زمان، تێگەی زمان، شوێنەوارە گشتییەکانی لەسەر تیگەیشتن. زمانپژانی مندالان و گەوران، زیانباربوونی زمان و جێگرەوەکانی تری زمان، وەك زمانی ئیشارەی نابیستان، لەم کۆمەڵەدا جێگایان دەکەینەوە. لە دووەمین ژێروتەی ئەم گروپەدا، کەڵك وەرگرتن لە زمان بۆ مەبەستی ئەدەبی، تاوتوێکردنی ئامرازە رووکارە هۆنراوە (وەك، کێش و سەروا و نوێنەی تر) خەسڵەتەکانی زمانەوانی پەخشان و پێکهاتەی واتایی داستان، جێگایان دەکەینەوە. سەرئەنجام لە سێهەمین گرۆپدا، ئومێدەوارین بەرهەمی کۆمەڵناسی زمان و پەیوەندی زمان و رۆڵی زمان لە شێوەکانی تری کۆمەڵایەتیدا، وەك باوەڕە دینییەکان،، رێکخراوە لێکنزیکەکان، جاد و هونەر بلاوبکرێنەوە. هیوادارم بتوانم لە ناو ئەو

بەرهەمانـەی، پەیوەنـدیان بـە پێشـینەی تـاوتوێکردنی زمانییـەوە هەیـە، ئـەم بەرهەمانەی خوارەوە بگونجێنم: لێکۆڵینـەوە مێژووییـەکان لـەبارەی میتۆدەکـانی وەصفی زمان، بە تایبەتی ئـەوەی پێشـەوایانی مـەزنی زماناسـی نـوێ بـەکاریان هێناوە، واتە دەستوورگەرایانی زمانی سانسکریت، توێژەرانی سەردەمانی دێرین و سـەدەکانی ناوەڕاسـت٠ توێـژەرانی عـەرەب و و زمانـەکانی رۆژئـاوا)، هـەروەها سـەردەمی نـوێ. ئـەم لێکۆڵینەوانـە لەبەرامبـەر ئـەو لێکۆڵینەوانەیـە، کـە فەلسەفیانەترن و پەیوەندیگـەلی قـووڵتر تـاوتوێ دەکـەن، کـە بـەردەوام لـە نـاو لێکۆڵینەوەکانی زمان لەلایەك و، لەلایەکی تر لە دەروناسی تیۆری و فەلسـەفەی مێشك دا، هەبوون.

**نوام چۆمسکی**

**مۆریس هاله**

# پێشەکی

ئەگەر بمانەوێ باسێکی کورت و زۆر وردی ژیانی نەژادەکانی
ئەوروپای پێش دووسەدەو نیو بخەینە بەردەست، پێویستە
بڵێین ئەوان لەو سەرمایە فکرییەیان هەڵێنجاوە کە بلیمەتانی
سەدەی حەڤدەهەم کۆیان کردبۆوە.

**ئالفرید وایتهید، زانستەکان و دنیای نوێ (١٩٢٥)**

وتەی بەناوبانگی **وایتهید** کە لەسەرەوە هاتووە، زەمینەیەکی بەسوود بۆ مێـژووی زمانناسی لە سەردەمی نـوێ دا، دەرِەخسـێنێ. نرخانـدنی ئـەو، ئەگـەر لـەبارەی تیۆری پەیوەست بە پێکهاتەی زمان بەکار ببرێ، بە پێی دەسـکەوتەکانی سـەدەی هەژدەهەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەهـەم، بـە تـەواوی راسـتە. لەگـەڵ ئەمەشـدا، زمانناسی نوێ بە وریاییەوە خۆی لە تیۆورییە کۆنەکانی زمانناسی جیاکردۆتەوە و هەوڵ دەدا بە رێگایەکی باش و سەربەخۆ، تیورییەك لەمەرِ زمان تۆمار بکات. بە گشتی زماناسانی شارەزا، لـە بـواری تیـوری زمانناسـی دا ئەوەنـدە حـەزیان لـە دەسکەوتەکانی نەریتی ئەوروپایی نییە. ئەوان دەستیان داوەتە پرسگەلی جیـاواز، ئەوەیش لە چوار چێوەی هزری تر دا. ئەو پرسیارانەی بوون بـە هـۆی لێکۆڵینـەوە سەرەتاییەکانی زماناسیی و گەیشتن بە چەند وەڵامێـك، لـەو چوارچـێوەیەدا هـیچ شوێنیکیان نییە. لە ئێستادا، دەرئەنجامی توێژینەوەکانی پێشوو یا بـە نـەزانراوی ماونەتەوە، یا بە دزێوی باسیان دەکرێ. ئەو لێکۆڵینەوە نوێ و جۆراوجۆرانـەی لـە مێژووی زمانناسی دا ئەنجام دراون، ئەم هەڵویستەیان وەرگرتووە کە (*تێکرِای ئـەو لێکۆڵینەوە زمانییە گرینگانەی بەر لە سەدەی نوزدەهەم، کە ئەمرۆ لە چواچـێوەی*

*زماناسی دا نین، دەکرێ لە چەند رستەدا کورت بکرێنەوە)*[1]. وەلێ لەم ساڵانەی دواییدا، ئەو پرسانە کە لە سەدەی حەڤدەهەم و هەژدەهەم و سەرەتای سەدەی نوزدەهەم بە شێوەیەکی جیدی و پڕ بەرهەم کەوتنە بەر لێکۆڵینەوە، جارێکی تر کەوتنەوە بە سەرنجێکی زۆر. پتر لەوەش، گەڕانەوە بۆ حەزە کلاسیکییەکان بە دۆزینەوەی چەند لایەنێك کۆتایی هات، کە لەو سەردەمەدا بە باشی نەناسرابوون، ئەو سەردەمەی کە من بەو بەڵگانەی خوارەوە ناوی دەنێم سەردەمی (**زماناسی دیکارتی**).

تاوتوێ کردنی وردی هاوشێوەکانی زماناسی دیکارتی و هێندێك دەسکەوتی هاوچەرخ، لە زۆر رووە بەرهەمدارە، وەلێ شرۆڤە کردنی ئەم وێکچووانە لە توانای ئەم وتارە بەدەرە. ئینجا، هەرجۆرە هەوڵێك بۆ خستنە رووی لێکدانەوەیەکی ئاوا، بەهۆی بارودۆخی نالەباری بەشی مێژووی زماناسی، ناوەخت دەبێ (دیارە دەبێ بزانین بارودۆخی نالەباری ئەم بەشە، خۆی تارادەیك **هۆکریاوی**[2] سەردەمی نوێیە، کە دزێوکردنی بەرهەمەکانی پێشینیان تایبەتمەندی دیاری ئەو سەردەمەیە).

لێرەدا من خۆم بۆ ئامانجیکی ئاسانتر واتە پرۆژەی سەرەتایی و گشتی، هێندێك پرسی زماناسی دیکارتی تەرخان دەکەم، وەلێ باسی شیکردنەوەی پەیوەندی ئەو ئامانجە لەگەڵ لێکۆڵینەوەکانی ترەدا ناکەم، کە دەخوازن روونی بکەنەوە یا پەرەی پێبدەن. بۆ ئەو خوێنەرەی کە لەگەڵ لێکۆڵینەوەکانی **دەستووری بەرهەمهێن**

---

[1] - **ئارنوا** بەگشتی لەگەڵ ئەم بۆچوونەیە و بڕوای وایە، کە ناتوانین زماناسی کلاسیك بەزانست دابنێین، ئەو مێژووی زماناسی پێش ئەوەی زماناسی ببێتە زانست، تاوتوێ دەکات. کەسانی تریش چەندین جار رای هاوشێوەیان دەربڕیوە:

G. Harnois "Les theories du Language en France de 1660 Romanes a 1821", Etudes Francaises, vol. 17 (1929)

[2]- **هۆکار و هۆکریاو** لە بری علت و معلول عەرەبی بەکار هاتووە. و/ کوردی

ئاشنایه، تێگەیشتن لەو پەیوەندییە زەحمەت نییە[1]. وەلێ سیمای گشتی ئەم پرۆژەیە، ئەو پرسانە دیاری دەکەن کە ئەمڕۆ کەوتوونەتە بەر سەرنج. بە واتایەکی تر، من هەوڵنادەم زمانناسی دیکارتی وەك چۆن خودی زانستەکە دەخوازێ ئاوا باسی بکەم[2]، بەڵکو هەوڵدەدەم سەرنجی خۆم بخەمە سەر ئەو روانگە و بۆچوونانەی

---

[1]- مەبەستی من لە **دەستووری بەرهەمهێن** (generatin rule) باسکردنی توانای نائاگایانەی ئاخێوەر و بیسەرە، کە ژێربینای کردەی راستەقینەی ئەو لە گوتار دایە. **دەستووری بەرهەمهێن**، لە شێوەی بەرنامەیی خۆی دا، رەنگدانەوەکانی **دەنگسازی** و **رستەسازی** لە پانتاییەکی بێ سنووردا پێکەوە دەبەستێتەوە و، گریمانەیەك لەمەڕ چۆنییەتی لێکدانەوەی گوتار بە هۆی ئاخێوەر و بیسەرەوە، دەخاتە روو و زۆر فاکتەری شاراوە لێدادەبڕی، کە لەگەڵ کردەی زمانی دا تێکەڵاوبوون. بۆ روون کردنەوەی پتر بڕوانە:
Katz and Postal, An Integrated Theory of Linguistic Description (Cambridge M. I. T. Press, 1964), Chomsky, Current Issuse in Linguistic Theory (The Hague, Mouton and Co. 1964), Aspects of the theory of Syntax (Cambridge, M. I. T. Press, 1965)

[2] – هەروەها دەتوانین وای دابنێین کە بیرمەندانی ئەو قوتابخانەیەی من ناوم ناوە (زمانناسی دیکارتی)، خۆیان بە پەیڕەوی نەریتێکی تایبەتی دەزانن بە دڵنیاییەوە ئەم گریمانەیە راست نییە. مەبەستی من لە زمانناسی دیکارتی بە تایبەتی کۆمەڵێك بیرو راو رای دوو نەریت **دەستووری فەلسەفی** یا **هاوبەشی گشتییە**، کە دەتوانین رەگ و ریشەیان لە کتێبی **دەستووری گشتی سەلمێنەرانەی** پۆرت رۆیاڵ (١٦٦٠) و لە **زمانناسی هاوبەشی گشتی** کە لە قۆناغی رۆمانتیك و دوای ئەو پەرەیسەند، هەروەها لە **فەلسەفەی ئەقلگەرایانەی زەین** دا، بدۆزینەوە، کە پێشزەمینەی هاو بەشی ئەم دووانە بووە. ئەوەی کە دەستووری گشتی لە بۆچوونەکانی دیکارتەوە سەریان هەڵداوە وتەیەکی نوێ نییە، بۆ نموونە، **سان بۆڤ** تیوری دەستووری پۆرت رۆیاڵ (بە لقێکی فەلسەفەی دیکارت دەزانێ کە خودی دیکارت هۆی پەرەسەندنی نەبووە. پۆرت رۆیاڵ ج ٣ ١٨٨٨ ل ٥٣٩). هاوئاهەنگی **زمانناشی هاوبەشی گشتی** لە قۆناغی رۆمانتیکدا، لە یەکەمین سەرنجدا لەگەڵ ئەم کۆمەڵەیە دێتە بەرچاو، وەلێ من هەوڵ دەدەم نیشانی بدەم کە هێندێك تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی (هەروەها ئەو تایبەت مەندییانەی کە من پێوایە بە نرخترین دەسکەوتەکانییەتی) بگەڕێنمەوە بۆ پێشینیانی دیکارت.
بە هۆی باسی تیورییەکانی رۆمانتیکی **زمان و زەین** لەم چوارچێوە دیاریکراوەدا، پێویستەمن واز لە باسکردنی لایەنەکانی تری ئەم تیورییە بێنم، بۆ نموونە دەتوانم ناوی organiscism بێنم، کە بە راست یا هەڵە کاردانەوەیك بووە بەرامبەر شێوازی دیکارتی. بە شێوەیکی گشتی دەبێ جەخت لەسەر ئەوە بکەمەوە

بەشێوەیکی تۆکمە و سەربەخۆ لــە بەرهەمــە نوێیەکانــدا، دەرکــەوتوون. ئامــانجی سەرەکی من، تەنیا ئەوەیە کە هەندێك توێژینەوەی نەناسراو، بخەمە بەردەمی ئــەو کەسانەی، کە بە لێکۆڵینەوە لەسەر **دەستووری بەرهــەمهێن** و دەرکەوتەکانییــەوە خەریکن. ئەم رەئییانە لەگەڵ خولیا و پرســەکانی ئەوانــدا دەگــونجێ، زۆرجــار بــە هەمان دەرئەنجامی تایبەتی ئەوان کۆتایی دێت.

ئەوەی ئێمە لەم کتێبەدا دەیخەینە بەردەست، وەك وێنــەی دەموچــاوێکە کــە هــەر بەشێك لە بەشەکانی لە شوێنێك وەرگیراوە. کەس نییە بتــوانێ لــە ســەر بنــەمای نووسینەکان، بانگەشەی ئەوە بکا کە تێکرای ئەم بیروباوڕانە هی ئەو بووە. رەنگــە **هامبۆڵت** کە راستەوخۆ لە سەر خاڵی بەیــەك گەیشــتی ئەندێشــەی **ئەقلگــەرا**[1] و **رۆمانتیکــدا** وەســتاوە، بەرهەمــەکانی لــە زۆر رووەوە لــە خــاڵی ترۆپکــی ئــەم بیرکردنەوەیەدایە، نزیکترین کەسی ئەم بارودۆخە بێ. هاوکــات زاراوەی زماننناســی دیکارتی لە تیوری زمانی دا، دەکرێ بۆ ئەو رایانە بە چەند بەڵگــە نــەگونجاو بــن: **یەکەم**، ئەم رایانە خۆیان رەگ و ریشەیان لە بەرهەمکانی کۆنتری زماننناسی دایە، **دووەم**، زۆر لە پڕکارترین بانگەشــەکارانی ئــەم بیرکردنەوەیــە، بــە تــەواوی خۆیــان بەدژی زانیاریەکانی دیکارتی دەزانن، **سێهەم**، **دیکارت** خۆی زۆر گــوێی نەداوەتــە

---

کە ئامانجی من گواستنەوەی ئەندێشە و رێنوینی تایبەتی نییە، بەڵکو ئامانجم بایەخدانــە بــە نــاوەرۆك و لــە کۆتایی دا گرینگییانە لە لەم سەردەمەدا.

لێکۆڵینەوەیکی ئاوا، دەتوانێ بەشێك لە تاوتوێ کردنی گشتی تــری زماننناســی **دیکــارتی**، بــە بەرامبــەریی کۆمــەڵێك گریمانــە و رێنــوێنی بزانــرێ، کــە زماننناســی **پێکهاتەگــەرا** و پــۆلێنکردنی نــوێ، هــەروەها گۆڕانکارییەکانی هاوئاراستەی ئەو لە فەلسەفە و دەروونناسیی دا، بەرجەستە بووە. وەلێ من نامەوێ لێــرەدا ئەم جیاوازییە بە تەواوی یا بە روونی شرۆڤە بکەم.

[1] -Mentalic 

زمان و، دەکرێ هێندێك لە بۆچوونەكانی بە شێوازی جیاواز لێكبدرێنەوە. هـەركام لەم را ناكۆكانە تا رادەیەك راستن. لەگەڵ ئەمەشدا، بە بڕوای من لەو قۆناغەدا كە ئێمە لەبەرچاومان گرتووە، لە كۆمەڵێك رەئی و ئەنجامگیری پەیوەست بە چـییەتی زماندا، كە لەگەڵ تیورییەكی دیاركراوی تایبەت بە **زەین**[1] هاوڕێ بووە، گۆڕانێكی لۆجیكی و بەسوودی وەدیهات، كە دەتوانین بە درێژەی شۆڕشی دیكـارتی دابنـێین. بەهەر حاڵ، پەیوەندی زاراوەكە خۆی هیچ بایەخێكی نییە. پرسی گرینگ ئەوەیـە، كە چییەتی وردی زمان، ئەم سەرمایە گەورەی هزری، كە پێش سەردەمی مـۆدێرن هاتۆتە ئاراوە، دیاری بكرێ و بایەخی ئەمڕۆی ئەم دەسكەوتانە، مەزندە بكـرێن و ریگاكانی كەڵك لێوەرگرتنیان، لە بەرەو پێشبردنی زمانیی دا بدۆزرێنەوە.

[1] – ئێمە پێویستە بزانین لە قۆناغێك داین، كـە پێشـەنگی لێكجیاكردنـەوەی **زمانناسـی** و **دەروونناسـی** و **فەلسەفەی**ە. پێداگرتنی هەریەكێكیان لەسەر ئـەم بەشـە زانسـتییانە، بـۆ خـۆ رزگـاركردن لـە خشـتوخاڵی بەشەكانی تر، دیاردەیەكی نوێیە. جارێكی تر دەڵێم، توێژینەوە هاوچەرخەكان لە سەر دەستووری بەرهەمهێن، دەگەرێتەوە بۆ روانگە كۆنەكان و پەیوەندی پێگەی زمانناسی لەگەڵ لێكۆڵینەوكانی تر.

## لایەنی داهێنەرانەی کردەیی زمان

لەگەڵ ئەوەشدا دیکارت لە نووسینەکانی خۆیدا تەنیا ئاماژەیەکی کورتی بە زمان کردووە، هەندێك لە بۆچوونەکانی ئەو لە بارەی چییەتی زماندا، رۆڵێکی گرینگیان لە هەوێنکردنی بۆچوونی گشتی ئەودا هەیە. **دیکارت** لە کاتی تاوتوێکردنی قووڵ و وردی سنوورەکانی روون کردنەوەی میکانیکی، کە لە بواری فیزیکی تێپەڕاند و گەیاندییە بواری فیزیۆلۆژی و دەروونناسی، بەو بڕوایە گەیشت کە دەتوانین هەموو لایەنەکانی رەفتاری ئاژەڵی بەم گریمانەیە روون بکەینەوە[١]، کە ئاژەڵ ئامێرێکی خودکارە. ناوبراو لە کاتی ئەم توێژینەوانەدا، سیستمێکی فیزیۆلۆژی داهێناوە، کە زۆر گرینگ و کاریگەرە. وەلێ ئەو لە کۆتاییدا بەو ئەنجامە گەیشت کە مرۆڤ توانایی ئەو تۆی هەیە، ناتوانین تەنیا بە بەڵگەی میکانیکی رووت لێکیبدەینەوە. هەرچەندە دەتوانین کردەوە و رەفتارە جەستەییەکانی مرۆڤ، تا رادەیەکی زۆر لەسەر

---

[١]- ئەو لەبارەی ئەم پرسە کە گریمانە پێشنیار کراوەکانی لەمەڕ روونەکردنەوە، بە واتای رەها (راست)ن یا نا، چونکە پرسیارێکی ئاوا لە چوارچێوەی بیرکردنەوەی مرۆڤ بەدەرە. ئەو تەنیا خووی بەم وتەوە گرتووە، کە ئەم گریمانانە کاریگەر نین، هەرچەندە لەم رووە شتێکی تایبەت نین. بڕوانە:
principles of philosophy, Principle CCIV
پێویستە ناوەرۆکی ئەم باسەمان لەمەڕ ئاستەنگەکانی لێکدانەوەی میکانیکی، بە تەواوی لەبیر بێ. پرسەکە ئەوە نییە کە بوونی **زەین**، وەك جەوهەرێکە کە خودی بیرکردنەوەیە. بە رای دیکارت، دەتوانین بەروونی لە رێگەی **دەروونگەراییەوە** لەم بابەتە بگەین و، لە رستیدا بوونی ئەم پرسە لە بوونی خودی جەستە ئاسانتر دەسەلمێنرێ. ئەوەی گرینگە بوونی زەینگەلی ترە، ئەمیش تەنیا لە رێگەی بەڵگەی ناراستەخۆوە پەی پێدەبرێ، کە **دیکارت** و هاوبیرانی دەیخەنەروو. لە روانگەی بیرکردنەوەی هاوچەرخ، ئەم هەوڵانە بۆ سەلماندنی بوونی زەینگەلی تر قەناعەتهێن نین، بۆ نموونە، **پی یر بایل** بێ توانایی دیکارتییەکانی لەمەڕ سەلماندنی زەینگەلی تر بە (*لاوازترین لایەنی قوتابخانەی دیکارت* ) دەزانێ: پێشەکی لە:Rorarius , Bobbs
Historiticl and critical dictionary 1697 selections translated by. R. h. popkin, Bobbs-Mrrill,Indianapolis. 1965, p.231 

بنەمای چەند بەڵگەی میکانیکی روون بکەینەوە. دیارترین جیاوازی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ لە زمانی مرۆڤ دایە، بە تایبەتی پەیوست بە توانای دروستکردنی وتەی نوێ، کە بیری نوێ دەردەبڕێ و دەگونجێ بۆ بارودوخی نوێ. لە روانگەی دیکارتەوە دەتوانین بڵێین:

**ئامێرێك دروست بکەین کە بتوانێ وەشەکان ئەدا بکات، یا کاردانەوەی جەستەیی نیشان بدات، کە ببێتە هۆی وەدیهێنانی گۆڕانکاری لە ئەندامەکانی لەشی دا. بۆ نموونە ئەگەر دەست لە شوێنێکی تایبەتی جەستەی بدەین رەنگە بپرسی ئێمە چیمان گەرەکە، وە لە خاڵێکی تری بڵێ هەست بە ئازار دەکات، وەلێ هەرگیز وتەکانی بە شێوازی جیاواز رێك ناخات، تا بۆ هەر بابەتێك کە بە ئامادەبوونی ئەو ئەنجام دراوە، وەڵامێکی گونجاو لە زەینی دابێت، لەکاتێکدا ئەم توانایە لە نزمترین ئادەمیزاددا هەیە**[١].

تونای کەڵك وەرگرتن لە زمان نابێ، بە **جوڵانەوەی سروشتی** لێکبدریتەوە، کە پێشاندەری خۆشی و هەڵچوونە و ئامێریش دەتوانێ لاسایی ئەم جوڵانەوانە بکاتەوە، هەم ئاژەڵیش دەتوانێ ئەنجامیان بدات. جیاوازی سەرەکی لەوە دایە کە ئامێر خودکار *(هەرگیز ناتوانێ بەو شێوەی ئێمە ئادەمیزاد کاتێك بیروبۆچوونەکانمان بۆ کەسانی تردەخەینە روو، کەڵك لە وتار یا نیشانەی تر*

---

[1] -Discours on Method, part v. in the philosophical Works of Descartes, Translaited E.S Haldane G. R. T. Roos vol 1. p 116

لە وتە گوازراوەکانی لاپەڕەی ١١٦ و ١١٧. بە گشتی، کاتێك کەڵك لە وەرگێڕاوی دەقە ئینگلیزییەکە وەردەگرین، کە وەرگێردراو و دەقە سەرەکییەکە هەردووکیان بە ئاسانی لەبەردەست دابن. هێندێکجار لە ناوهێنانی سەرچاوە سەرەکییەکان دا هەندێك نیشانەی خاڵبەندی راست دەکەمەوە.

وەربگرێ). ئەم توانایە تایبەت بە ئادەمیزادانە و هیچ پەیوەندییەکی بەهۆشەوە نییە. لەبەر ئەوە:

**پێویستە زۆر سەرنج بدەینە ئەم واقعییەتە کە هیچ کەسێك واتە مرۆڤێك نادۆزینەوە، تەنانەت مرۆڤی گێل و دواکەوتوی ئەقڵی یا شێتیش، نەتوانێ بۆ دەربڕینی بیرۆکەکانی زاراوەی جۆراوجۆر، لە قالبی چەند دەستەواژەیەکدا دارێژێ. لە لایەکی تر هیچ ئاژەڵێك نییە، هەرچەندە کامڵ و شارەزا بێت، بتوانێ ئەو کارە بکات.**

هەروەها ناتوانین ئەم جیاوازییەی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ، لە سەر بنەمای جیاوازیی فیزیۆلۆژی نێوان ئەم دووانە، روون بکەینەوە، دیکارت پێمان دەڵێ:

**ئەم توانایە بە هۆی بوونی ئەندامەکانی ئاخاوتنەوە نییە، چونکە توتی و مورغی میناش دەتوانن وەك ئێمە وشەکان ئەدا بکەن، وەلێ ناتوانن وەك ئێمە بدوێن، واتە نیشانمان بدەن سەبارەت بەو شتەی دەیڵێن بیربکەنەوە. لەلایەکی تر تەنانەت ئەو مرۆڤانەی کەڕو لاڵی زگماکین، لەبەر ئەوەی لە ئەندامەکانی ئاخاوتن بێبەشن، لە بارودۆخی شیوە ئاژەڵ یا خراپتر دان، هەمیشە چەندان هێما ونیشانە دەخولقینن بۆ تێگەیاندنی کەسانی تر لە مەبەستەکانیان.**

بە کورتی جۆری مرۆڤ، خاوەنی توانای تایبەت بە خۆیەتی، واتە خاوەنی نەزمێکی زەینییە تایبەتە، کە ناکرێ وابزانین پەیوەستن بە ئەندامەکانی **هۆشی گشتی**[1] ئەو

---

[1]- general intelligence. بۆ راو بیروبۆچوونی نوێ لەم بارەوە بڕوانە:
E. H. Lenneberg, "A Biological Perspective of Language "in new directions in the study of Language, edited by E. H. Lenneberg. M. I. T. Prees, 1964

واتە مرۆڤ. هەروەها دەرکەوتنی ئەو شـتە بـە جۆرێکـە کـە دەتـوانین بـە لایـەنی داهێنەرانەی کـردەوەی رۆژانــەی زمــان دایبنــێین: ئــەو تایبەتمەندییــەی کــە هــیچ سنوورێکی بۆ نییە و لە هەر بزوێنەرك سەربەخۆیە. بەم پێیە **دیکارت** بـەو ئاکانـە گەیشت کە زمان ئامرازێکە بۆ راڤەکردنی ئازادانەی بیرکردنەوە، یا کاردانەوەیەکە بەرامبەر بارودۆخی نویٚ و، هیچ گوتەزایەك پەیوەندی بە بزوێنەری دەرەکی یا هەل و مەرجی فیزیکییــەوە نییــە و، بــە هــۆی چــۆنییەتی **نــادەورانی**[1] خــۆی شــایانی شوناسایی کردنە[2].

---

[1] -noncircular

[2]- تایبەتمەندییەکانی بیٚ سنووریی و بەتالٚ بوون لە هەر بزوێنەرێك، لە یەکتر سەربەخۆن. دەزگایەکی خودکار تەنیا دوو کردەی هەیە، کە بە رێکەوت ئەنجام دەدرێن. دەزگای دەنــگ تۆمــارکردنی شەخســی، کــە زانســتە زمانییەکەی لە سنووری نووسینە، بەرهەمێکی کەمی هەیە، کـە لـەم واتایـەدا بـەدەر لـە بزوێنــەر نییــە. پەیڕەوانی دیکارت، رەفتارەکانی ئاژەڵ بەگشتی بە بیٚ سنوور دەزانن، بەڵام نەك بەتالٚ لە بزوێنــەر، هــەر لــەم رووەوە، وەك وتەی مرۆڤ بە **داهێنەری** دانانێن. بۆ نموونە بڕوانە:

Francios Bayle, The general system of the Cartesian Philosophy, 1669

(وەرگێڕاوە ئینگلیزییەکەی ١٦٧٠ ، ل٦٢):

لەبەر ئەوەی کاریگەری شتومەك لەسەر هەستەکان بیٚ سنوورە، لــە حالّەتــە روحییەکانــدا، جۆراوجــۆری زۆر بەرچاو بۆ ویستی بزواندنی ماسولکەکان لە ئارادایە، سەرئەنجام جموجوڵی ئاژەڵەکان بیٚ ســنوورە. چــونکە تــا ژمارەی ئەندامەکان پتر بیٚ، لە پێکهاتەیاندا ئامادەکاری پتر کرابیٚ، جۆراوجۆری جموجوڵەکان پترە. بەڵام بــیٚ سنووری بوونی وتەی مرۆڤ، بۆ دەربڕینی بیرکردنەوەیکی بیٚ سنوور، بــە هــۆی ئــازادبوونی لــە کــە کــۆنترۆڵی بزوێنەرە دەرەکییەکان و گونجانیان لەگەڵ هەل و مەرجی نویٚ، وتەیەکی ترە.

گرینگە جیاوازی دابنێن لە نێوان (**گونجاوی رەفتار بۆ هەل و مەرجی نویٚ**) لەگەڵ (**کۆنترۆڵی رەفتار بە هــۆی بزوێنەر**). دووەمیان، تایبەتمەندی دەزگای خودکارە، بەڵام لەمەڕ بابەتی **یەکەم** بڕوایان وایە لەبــەر فرەجــۆری رەفتاری مرۆڤ، ئەم تایبەتمەندییە دەکەوێتە دەرەوەی سنووری **لێکدانەوەی میکانیکی**.

لێکۆڵینەوە نوێیەکان لە بــواری پەیوەندییــە ئاژەڵییەکانــدا، تائێســتا بەڵگەیــەکی نــەداوە بەدەســتەوە، کــە پێچەوانەی ئەم گریمانەی دیکارتی بێت، کە زمانی مرۆڤ لە سەر چەند بنەمایەکی تــەواو جیــاواز دامــەزراوە. تێکرای دەزگا ناسراوەکانی پەیوەندی ئاژەڵیی، یا چەند نیشانەیەکی دیاری کراو لەخۆ دەگریٚ، کە هەریەکەیان

بە لەبەرچاو گرتنی ئەو گریمانەی، کە ناتوانین بۆ لایەنی داهێنەرانی کردەی ئاسایی زمان، روونکردنەوەی میکانیکی بخەینە روو، **دیکارت** بەو دەر ئەنجامـە گەیشـت، کە مرۆڤ دەبێ سەرەڕای جەستە خاوەنی زەینیش بێت *(واتە خاوەنی ئەو مادەی کە مـاکی سـەرەکی بیرکردنەوەیـە)*. بـە سـەرنجدانە ئـەو باسـانەی **دیکـارت** لەمـەڕ پەیوەندی زەین بەو جەستانەی وەك لەشی ئەون، روونە کە ئەم مـادە گریمانـەکراوە وێرای **بنەمای داهێنەر،** رۆڵی **بنەمای میکانیکی**[١] دەگێڕێ کە کردە جەستەییەکان وەدی دێنن. لە راستی دا ئەقڵی مرۆ *(ئامرازێکی هاوبەشی گشتییە کە لە هـەموو پێشهاتەکاندا بەکار دێت)*. لە کاتێکدا ئەندامەکانی هەر ئاژەڵ یا ئامێرێك *(دەبـێ بۆ هەر کارێکی تایبەت، بە تایبەتی خۆبگونجێنن)*[٢].

---

بەستراوەتەوە بە هەل و مەرجی دەرهاویشتە یا بارو دۆخی دەروونی، وەیا بڕێکی نەگۆڕ **رەهەندی زمـانین** کـە هەر کامێکیان پەیوەندی بە رەهەندێکی **نازمانییەوە** هەیە، بـەو مانایـەی کـە هەڵبـژاردنی یـەکێکیان، بـە ناچاری هەڵبژاردنی یەکێکی تری بەدوادا دێت. ئەم دوو حاڵەتە هیچ کامیان، وێکچـوونێکی دیاریـان لەگـەڵ زمانی مرۆڤ دا نییە. پەیوەندییـەکانی مـرۆڤ و پەیوەندییـەکانی ئاژەڵـەکان، تـەنیا لـە رەفتـاری گشـتی دا هاوبەشن، کە جگە لەرەفتاری زمانی هەر رەفتارێکی تر دەگرێتەوە.

[1] -creative principle ، mechanical principle"

[٢]- کەواتە بەگشتی (هەرچەند ئامێرەکان دەتوانن هەندێك کار وەك ئێمە تەنانەت باشـتر لـە ئێمـەش ئـەنجام بدەن، وەلێ بە دڵنیاییەوە لە کارەکانی تردا ئەم توانایەیان نییە و لە ئاکامدا دەردەکـەوێ، کـە کـاری ئـەوان لەسەر بنەمای مەعریفە نییە، بـەڵکو بـە هـۆی ئۆرگـانی ئەندامەکانیانەوەیـە). کەواتـە دوو تاقیکردنـەوی دیاریکراو هەن، کە دەتوانین لە رێگەی ئەوانەوە بزانین ئایا ئامێر مرۆڤـە یـان نـا: **یـەکێکیان** تاقیکردنـەوەی لایەنی داهێنەرانەی کەڵك وەرگرتنە لـە زمـان و **ئـەویتریان** تاقیکردنـەوەی جۆراوجـۆری کـردەوەی مرۆییـە. (تائەندازەیەك مەحاڵە ئامێر بتوانێ ئەوەندە فرەجۆری پەسند بکات، بۆ ئەوەی لە تێکڕای هەل و مەرجەکانی ژیان هەر بە هەمان شێوە کاربکات، وەك چۆن ئێمە بەهۆی لـۆجیکی خۆمانـەوە کاردەکـەین. **دیکـارت** بـە وەرگرتنی ئەم بۆچونانە، **هێزی مەعرفە** وەك ئەو توانایە لەبەرچاو دگرێ، کە تەواو چالاك نییە و (لە کاتێکدا ناوی دەنێ زەین کە بیرۆکەی نوێ بخولقێنێ، یا سەرگەرمی ئەو بیرورایانەبێ کە پێشوەخت هەوێن کراون). بـە

بڕوای **دیکارت**، زەین بە شێوەیەك كار دەكات، كە بەتەواوی لە ژێر فەرمانی **هەستەكان** یا **خەیاڵ** یا **یادگە** دا نییە.

Rules for the direction of the mind, 162 B; Haldane and ross, p 39).

دیكارت پێش ئەمە وتوویەتی: (ئێمە لە كامڵی كردەوەی ئاژەڵی بەو ئاكامە دەگەین كە ئەوان ئازادی ئیرادەیان هەیە) وەرگیراو لە **رۆزنفیلد** لە كتێبی:

From Beast- Mashine to Man-Mashine, New York, Oxford University Press, 1941, p.3

كە ئەمە یەكەمین گەڕانەوەی دیكارتە بۆ پرسی نەفسی ئاژەڵی)

ئەم رایەی كەوا **هێزی مەعریفە،** تەنیا كاتێك دەتوانین پێیبڵێین **زەین،** كە لە هەندێك رووە و خاوەنی داهێنان بێت، شوێنی سەرهەڵدانی لەوە كۆنترە. یەكێك لەو سەرچاوانەی كە **دیكارت** بە تەواوی لەگەڵی دا ئاشنا بوو كتێبی (Examen de ingeios 1575) ، لە نووسنی **خوان هوارتە،** كە بە شێوەیەكی بەربلاو وەرگێردراو بلاوكرایەوە.(من لە وەرگێڕاوە ئینگلیزییەكەی **لامی** وەرمگرتووە ١٦٩٧). لە روانەگەی **هوارتەوە** زاراوەی Ingenio مانا ریشەییەكەی **وەدی هاتن** و بەرهەمهاتنە، ناوبراو ئەو زاراوەیە بە Ingenero, genero, gigno دەبەستێتەوە (ل٢). كەواتەدەتوانین دوو **هێزی بەرهەمهێن** لە مرۆڤدا بدۆزینەوە: **یەكێكیان،** ئەو هێزەیە كە لەگەڵ ئاژەڵ و گژوگیادا هاوبەشە، **دووەمیان،** هێزێكە خاوەنی **جەوهەری روحانی** و خوایی و فریشتە ئاسایە. (ل٣) (شعور Ingenio هێزی بەرهەمهێنە... و پەیپەری هێزی بەرهەمهێنە ل٣). مرۆڤ و **جەوهەری روحانی** بە پێچەوانەی بلیمەتی (Genius) ئیلاهی، ئەوەندە توانای بەرهەمهێنی نییە كە ئەوەی بەرهەمیدێنێ بوونی واقعی پێ ببەخشێ، بەڵكو تەنیا دەتوانێ رووداوێك لە یادگەدا بەرهەمبێنێ، واتە (خەیاڵ و ویناكردنی ئەوەی دەیزانین تێیدەگەین) كە دەبێ لە رێگەی كار و هونەرەوە بوونی واقعی بەدەست بێنێ (ل٤ و ٥).

بەم پێیە، زانست و هونەرەكان (جۆرە خەیاڵ و وێناكردنێكن، كە زەینی مرۆڤ لە یادگەدا تۆماری دەكا و، حاڵەت و پێكهاتەی سروشتی شتێك لەو زانستە تایبەتیە، لە ژیانی مرۆڤدا دەردەخا.(ل٦). ئەو كەسەی فێری زانستێك دەبێت پێویستە (لە دەرونی خۆیدا شێوەیەكی كامڵ و واقعی بەرهەم بێنێ) كە نیشانەی بنەما و پێكهاتەی ئەو زانستەیە (ل٦). زەینە چالاكەكان بەراستی (بە جۆرێكن كە تەنیا بە یارمەتی خودی بابەت و بێ یارمەتی وەرگرتن لە جەستە، هەزاران بیرو هزری هەڵێنجراوی دوور لە زەین دەخوڵقێنن، كە هێشتا لەبارەیەوی هیچ نەوتراوە. (ل٧).

دروشمی **ئەزمونگەرایی** مانای (جگە لەوەی لە رێگەی هەستەكانەوە بەرهەم دێ، هیچ شتێكی تر لە تێگە دا بوونی نییە). كە وتەی ئەرستۆیە (مَن فَقَد حِساً فَقَد فَقَدَ عِلماً)، تەنیا بۆ (داهێنەریی راهێنان وەرگر) راستە كە ئەم توانایەی نییە. هەرچەندە (شعوری تەواو) تەنیا یەك مەبەست (وەلێ دەبێ بزانین، ئێمە كەسانێكی زۆر

ڕۆڵەی سەرەکی زمان لە باسەکانی دیکارتدا، لـە نووسـراوەکانی دواتـری دا، بـە ڕوونییەکی پتر شرۆڤە کراوە. ئەو لە نامەیەکدا کە بۆ **مـارك نیۆکاسـلی** (١٦٤٦) نووسیوویەتی، **جەختی کردۆتەوە** کە (*بۆ ئەو کەسانەی بە لێکۆڵینـەوەی جەسـتەوە خەریکن، جوڵە دەرەکییەکانی لەش دەیسەلمێنن جەستەی ئێمە لە ئامێرێك بەولاوە*

---

دەناسین، کاتێك کە لێیان نزیك کەوتووینەتەوە و، وتەی ئـەو تۆیـان دەربڕیـوە کـە پێشـتر لـە هـیچ دەمێـك دەرنەچووە و لە هیچ کەسێکیش نەبیسراوە، کورت گوتەنی لە قوتووی هـێچ عەتتارێکـدا نییـە و/ کـوردی). (ل١٦). تەنانەت جۆر سێهەمی شعوریش بوونی هەیە (کە لەرێگەی ئەو شعورەوە، هێندێك کـەس بـێ هـیچ زانست و هونەرێك، وەتەی ئەوەندە سەیر و وسەرسوڕهێنەریان دەربڕیوە کە هەرچەند ڕاستن، بـەڵام پێشـتر نـە بینراون نە بیسراون، تەنانەت بەبیری هیچ کەس دا نەهاتوون). واتـا شـتێکی تێکـەڵ بـە شـێتی تێـدا بـەدی دەکرێ. (ل١٧). ئەم سێ جۆرە شعورە بەریز پەیوەندییان بە **یادگە** و **تێگە** و **خەیاڵەوە** هەیە.

بە گشتی (تێکڕای شانازی و مەزنی مرۆڤ، هەر وەك **سیسرۆ** وتوویەتی، نیعمەتی هەبوونی زمـانێکی ڕەوانـە: **ئەگەر شعور خشڵی مرۆڤە، زمان ڕەوانی ڕۆشنایی و جوانی شعورە**، مـرۆڤ تـەنیا بـەم بەڵگەیـە لـە ئـاژەڵ جیادەکرێتەوە و لە خوا نزیکترە کە باڵاترین بونەوەرە لە سروشت دا دەبینرێ. (ل٢٢) قورسترین (بـێ توانـایی شعور) کە بە هۆیەوە (مرۆڤ هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ ئاژەڵدا نابێ) بێ تواناییەکە کە زۆر لـە نێرەمووکـەکان دەچێت... کە توانای نەوە خستنەویان نییە). ئەم بێ تواناییە، ڕێگە لە هێزی ئاخاوتن دەگرێ دەسـتی ڕابگـا بە (یەکەمین بنەماکانی هونەر، کە پێش ئەوەی مرۆڤ دەست بە فێربوونیان بکات لـە زەینیـدا تۆمـارکراون)، ئەو بنەمایانەی کـە (شـعور هـەیچ نیشـانەیکی بوونیـان دەرناخـا، مەگـەر ئەوانـەی کـە پێشـتر هـەبوون، وەریانبگرێ، و ئەگەر مرۆڤ نەتوانێ وێناکردن یا لێکدانەوەیەکی ئازاد لە زەینی خۆی دا هەوێن بکا، دەتوانین بە ڕاستی بەو ئاکامە بگەین کە ئەو کەسە بە تەواوی لە بواری زانستەکاندا کلۆڵە). لەم حاڵەتەدا (نـە لێـدان نەداغکردن، نە ئاه و ناڵە، نە میتۆد، نە زمان، نە تاقیکردنەوە و نەهیچ شـتێکی تـر نـاتوانێ وای لێبکـات شتێك بەرهەم بێنێ. (٢٧ و ٢٨).

بۆ باسە سەرنجراێشەکەی دیکارت لە بارەی **هۆش دەزگای میکانیکی** دا بڕوانە:

K. Gunderson, "Descrates, La Mettrie, Languge & Machine" Pilosophy .vol. 39 pp. 193-222) (1964) بۆ زانینی زیاتر لەمەڕ پێشینەی گشـتی پەرەسـەندن و ڕەخنـەگرتن لـە تیوری دیکارت یا پانتایی و ئاستەنگەکانی لێکدانەوەی میکانیکی بڕوانە:

Rosenfield, op. ct, and H. Kirkine, "Les Origiens de la Conception moderne de I Homme-Machine" Annales Academiae, Scientairum, ser B, vol 122,Helsinki (1961)

*چیتر نییه، که لـه خۆیـه دەجـوڵێ، وەلێ ئامێرێکـه زەینـی هەیـه و ئـەو زەینـه بیردەکاتەوە، جگه لەو زاراوە یا نیشانانەی تر که زەین بـۆ دەرخسـتنی خـۆی بـێ گەڕانەوە بۆ سۆزەکان، دروستی کردوون).* ئەم مەرجەی دوایی بۆ ئەوە دانـراوە کـه (*هاتو هاوار نیشانەی خۆشییه نەك دەردو ئازار*) هـەروەها (*دەتـوانین ئـەوە فێـری ئاژەڵ بکەین*)[1] لەو توانایانه جیابکرێنەوە. ئەو له کتێبی **گوتار له میتـۆددا** هـەر ئەم شێوەیه دەگرێتەبەر و جارێکی تر جەخت دەکاتەوە، که هیچ مرۆڤێك ئەوەنـده کەم ئەندام نییه، نەتوانی زمانی بـۆ دەربڕینـی ئەندیشـەکانی بـەکاربێنێ، (*هـیچ ئاژەڵێك ئەوەنده کامڵ نییه، بۆ ئاگادارکردنەوەی ئاژەڵەکانی تر له هێنـدێك کـارو کردەوە، هێما یا نیشانەی ئەوتۆ بەکار بێنێ که پەیوەندیان به هەستەکانەوە نەبێ*) ئەو جارێکی تر هەموو غەریزەکانی ئاژەڵان، به نیشانەی نەبوونی بیرکردنەوە و بـه

---

[1] - واته به مەرجـداریی (conditional reflection)، کاتێـك کـه ئاژەڵێـك رادەهێـنین، رەفتارەکانیـان ئاکامی هەستکردنن، بەو مانایەی که ئەم رەفتارانه هاوڕێن لەگەڵ (بزاوتی ئارەزووەکان بۆ خـواردنی شـتێك) یا (هەستکردن به ترس و ئومێدی خۆشی). بەم پێیه، دیکارت رایگەیاند کـه (رەفتـاری گوتـاری) وەك هـەر کەڵك لێوەرگرتنێکی ئاسایی، بەتاڵە له هەر بزوێنەرێکی ناسراوی دەرەکی، یا بارودۆخی فیزیکـی دەروونـی. ناوبراو لەم بارەوە نادوێ، رنگه لەبەر ئەوەبێ که بابەتەکه ئەوەنده به روون و ئاسایی دەزانـێ، کـه باسـکردنی بێ هوودەیه. وەلێ ئەو خاڵەی جێگای سەرنجه ئەمەیه، که قوتابخانەی **رەفتارگەرایی هاوچـەرخ**، نکـۆڵی لـەم خاڵە ئاسایی و ئاشکرایانه دەکات. بۆ روونکردنەوەی پتر بڕوانه:

Chomsky. "Review of Skinner. Verbal Behavior" Language vol, 35. pp. 26-58: Aspects of the Theory of Seyntax. Chapter I.& 8, J. katz, Philosophy of Language, Harper & Row, 1966, J. Fodor, "Could Meaning be an $r_m$ "Joranal of Verbal Learning & Verbal Behavieor, vol, 4. pp. 73-81 (1965)

نموونەیەك دادەنێ بۆ سەلماندنی ئەوەی کە ئاژەڵان بە تەواوی ئامێری خودکارن. **دیکارت** لە نامەیەکی دا لە ساڵی ١٧٤٧ بۆ **هێنری مۆر** نووسیویەتی:

**وەلێ بە بۆچوونی من، بەڵگەی سەرەکی کە قەناعەت بە ئێمە دەکات، ئاژەڵان هەست و سۆزییان نییە، ئەمەیە، کە هەرچەند لە نێوان ئاژەڵانی تایبەت بە یەك جۆر، هێندێکیان لە هێندێیکان کاملترن (وەك چۆن لە ناو مرۆڤکانیش دا ئاوایە): هەرچەندە هەندێك ئاژەڵ لەوەی فێریان کراوە لەوانی تر بە تواناترن، وەك ئەوەی لە سەگلاوك و ئەسپی دەریاییدا دەبینرێ، هەرچەندە هەموویان دەتوانن بە روونی سەرنجمان بۆ لای جۆڵە سروشتییەکانی خۆیان رابکێشن، وەك تووڕەبوون، ترس، برسییەتی، چەند هەستێکی تر، ئیتر چ لە رێگەی دەنگ یا بەهۆی جوڵەی جەستەوە بێ، لەگەڵ ئەمەشدا ، تا ئێستا نەبینراوە هیچ ئاژەڵێك بەو پلەیەی کامڵ بوون گەیشتبێت، کە بتوانێ سوود لە زمانی وەربگرێ، واتە بتوانێ بە کەڵك وەرگرتن لە دەنگ یا جوڵەی تر، سەرنجمان بۆلای وتەیەکی بیرکردنەوە رابکێشێ، چونکە زاراوە تەنیا هێما و نیشانەی تایبەتی بوونی بیرکردنەوەیە، کە لە جەستەدا حەشار دراوە. وەلێ تێکڕای مرۆڤەکان، تەنانەت هەرە گەمژەو هەرە شێتەکەیان، کە ئەندامەکانی ئاخاوتنیان نییە، کەڵك لە نیشانە یا هێما وەردەگرن، کەچی ئاژەڵان هەرگیز کارێکی ئاوا ئەنجام نادەن، ئەمەش دەتوانین بە جیاوازی راستەقینەی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ دابنێین**[1] .

بەکورتی، **دیکارت** بە هۆی فرەچەشنی رەفتارەکانی ئادەمیزاد و، گونجانی ئەو رەفتارانە لەگەڵ بارودۆخی نوێ و، توانای ئادەمیزاد بۆ خوڵقاندن و داهێنان،

---

[1]-Torrey, The Philosophy of Descartes, pp. (284-287)

**رۆزن فیلد** ئەو بەشە لە نامەکانی **دیکارت- مۆر** کە پەیوەندی بە خودکار بوونی ئاژەڵەوە هەیە، لەم گۆڤارەی ژێرەوەدا بە تەواوی وەریگێڕاوە و بڵاوکردۆتەوە: Annals of science, vol. no.1 (1936)، دیکارت هەروەها روونی دەکاتەوە کە تا ئەو جێگایەی پەیوەندی بە ئەندامکەکانی جەستەوە هەیە، ئەو نکۆڵی لە ژیان یا هەستەکانی ئاژەڵان ناکا

ئادامیزان بە خاوەنی زەین دەزانێ. لە ناو ئەم تایبەتمەندییانەدا، داهێنانی ئادەمیزادە، کە کەڵك وەرگرتن لە زمان گرینترین نیشانەیەتی و گەورەترین شایەتی ئەم وتەیە. دیکارت وێناکردنی ئەم توانایە، بەدەر لە سنووری توانای هەر ئامێرێك لەقەڵەم دەدا. بۆ ئەوەی دروونناسێکی شارەزامان دەسبکەوێ، ناچارین، بە دڵنیاییەوە گریمانەی **بنەمای داهێنەر** و **بنەمای میکانیکی** بکەین، چونکە تەنیا بەم شێوەیە دەتوانین، هەموو لایەنەکانی جیهانی زیندوو و بێ گیان و پانتایی کردەوە و سۆزدارییەکانی مرۆڤ روون بکەینەوە.

**کووردۆموا** تێبینییەکانی دیکارتی لەمەڕ زمان و پرسی روونکردنەوەی میکانیکی زمان، لە توێژینەوەیەکی سەرنج راکێشدا شرۆڤە کردووە[١]. ئامانجی ئەو لەم لێکۆڵینەوە، ئەمەیە کە دیاری بکات، ئایا بوونی زەینگەلی تریش دەبێ بە بنەمای حاشاهەڵنەگر دابنرێ یا نەخێر[٢]؟ بەشێکی زۆری لە ئالۆزییەکانی رەفتارەکانی ئادەمیزاد، پەیوەندیان بە سەلماندنی ئەم خاڵەوە هەیە، کە مرۆڤەکان ئیتر ئامێرێکی خودکار نین، چونکە دەتوانین ئەم ئالۆزییانە لە چوارچێوەیەکی فیزیۆلجییانەدا روون بکەینەوە، واتە لە سەر کردە و ئەو گۆڕانکارییانەی لە وەڵامی گونجاو بۆ ئەم بزوێنەرە دەرکییانە، سەرهەڵدەدەن. بەڵام ئەم واقعییەتە کە

---

[١]- Discours Physique de la parole

ژمارەی لاپەڕەکان بۆ چاپی دووەمی ساڵی ١٦٧٧ دەگەڕێتەوە. لەم بەرهەمە وەرگێردراوێکی ئینگلیزی لەبەر دەستدایە، کە لە ساڵی ١٦٨٨ دا چاپکراوە، **رۆزن فیلد** رایدەگەیەنێ کە **کۆردۆموا** بە شێوەیك درێژەی بە باسەکەی دیکارت داوە لەمەر ئاخاوتنی نێوان ئاژەڵەکان، کە دوای ئەو ئیتر (ئەوەندە بایەخی پێنەدرا، وەك ئەوەی نووسەرانی دواتر ئەم باسەیان بە دوا وتە دانابێ لەربارەی ئەو بابەتە. (From Beast- Machine to Man- Machine p 40)

[٢]- لە روانەگەی **کۆردۆموا** هەروەها دیکارتیش، هیچ گرفتێك لەوەدا نییە کە ئەوان خاوەنی نەفسن، چونکە بە رای ئەو دووانە لە رووی **دەروونگەراییەوە**، دەتوانیین پەی بە بوونی نەفس ببەین.

مرۆڤەکان، (*جاری واهەیە بە هەموو توانای خۆیانەوە لەو شتە نزیك دەبنەوە، کە لەناویان دەبات و لەوەش دوور دەوکەونەوە کە دەیانپارێزێ.* ل٧)، سنووورداری بۆچوونێکی ئاوا نیشان دەدەن. مانای کردەوەکانی مرۆڤ لە ژێر ئیرادەیەك دایە هاوتای ئیرادەی خۆی. بەڵام باشترین بەڵگەی ئەوە بوونی ئاخاوتنە:

لە نێوان ئەو وتانەی دێنە سەر زمان، هاویوەندییەك لە ئارادایە و من هەرکاتێك گویم لە وتەیەك دەبیٚ هەست بەم هاویوەندییە دەکەم. (ل٨).

**لەبەر ئەوە لەگەڵ ئەوشدا باش دەزانم، ئامێرێکی بیٚ عەیب و کامڵ دەتوانیٚ چەند وتەیەك بەسەر زمان دا بێنیٚ، هاوکات دەشزانم لە نێوان ئەو فاکتەرانەی هەوا دابەش دەکەن، یا دەبنە هۆی کرانەوەی ڕێڕەوی هەوا، واتە شوێنی دروست بوونی ئەو دەنگانە، نەزم و ڕێکو پێکییەك هەیە کە ناگۆڕدریٚ، چونکە لەگەڵ بیستنی یەکەمین دەنگ، بە شێوەیەکی ئاسایی ئەو دەنگانەی بە دوای ئەو دادێن ئەوانیش دەبیسرێن، بەو مەرجەی ڕەوتی هەوایەکە نەپچڕیٚ. لە کاتێکدا بوونەوەرانی وەك من خولقێنراون، کە وتەی ئەو تۆ بەسەر زماندا دێنن، تارادەیەك کۆتایی یەکسانیان نییە، لەلایەکی تر دەبینم ئەم وتانە هەمان ئەو وتانەن، کە بۆ خستنە رووی بیرو هزری خۆم بۆ ئەوانی تر، دەبیٚ بەکاریان بێنم، و ئەوانیش لە وتەکانی من تێدەگەن. لە کۆتایی دا کاتێك لەبەرامبەر ئەو گیانلەبەرانەدا چەند وتەیەك بە سەر زمانمدا دێنم، تا پتر بایەخ بەو کاریگەرییە بدەم کە وتەکانم وەدیی دێنن، پتر تێدەگەم کە ئەم وتانە بیستراون. هەروەها ئەوەی ئەوان لە وەڵامی وتەکەی مندا دەیخەنە سەر زمانیان، ئەگەر بە تەواوی تێگەیشتنی وتەکانی من بێت، هیچ گومانێك نامێنیٚ، کە زەینی ئەوان هەمان شت لە دەروونی ئەواندا وەدی دێنی، کە زەینی من وەدیهێنا.ل(٨-١٠)**

کورتەی لێکدانەوەکی **کۆردۆموا** ئەمەیە، کە بۆ جوان بوون و پێکەوە بەستراوی وتەی ئاسایی، بە هیچ شێوەیەك ناتوانین **روونکردنەوەیەکی میکانیکی**[1] **بخەینە** بەر دەست. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو جەخت دەکاتەوە کە بۆ کەڵك وەرگرتن لە توانای ئاخاوتن، وەك بەڵگەیەك بۆ سەلماندنی نارێکی روونکردنەوەی میکانیکی، پێویستە وریا بین. ئەو پرسەی کە ئایا دەنگەکان بەرهەم دێن یا دەتوانین لاسایی ئاخاوتن بکەینەوە، هیچ بایەخێکی نییە، چونکە دەتوانین بە شێوەی میکانیکی ئەم بابەتانە بسەلمێنین. یا دەتوانین بۆ نیشاندانی بارودۆخی دەروونی و زەینی، **نیشانەی سروشتی**[2] بەکار بێنین، یان دەتوانین چەندین هێمای تایبەتی بە هۆی بوونی هاندەری دەرەکی، بەرهەمبێنین، کە ئەوانە هیچ پەیوەندییەکیان بە بابەتەکەوە نییە. رەنگە تەنیا توانای داهێنان، ئەویش بە شێوەیەکی گونجاو بۆ بارودۆخی نوێ و بەرهەمهێنانی گوفتاری هاوئاهەنگ، بە بەڵگەیەکی گرینگ دابنرێ. (*ئاخاوتن دووبارە کردنەوەی ئەو گوتەزایانە نییە کە دەگاتە گوێ... بەڵکو هێنانە سەر زمانی وتەی ترە لە بارەی ئەو گوتەزایانەوە.* ل ١٩). بۆ ئەوەی نیشانی بدەین کە مرۆڤ ئامێری خودکار نییە، پێویستە چەندین بەڵگ بهێنینەوە، کە نیشانی بدا، وتە هەم رەنگدانەوەی داهێنان و هەم وەڵامێکی گونجاوە بۆ وتەکانی تاقیکەرەوە (*ئەگەر بە هەموو تاقیکردنەوەکانی خۆمان بۆمان دەرکەوێ، وەك چۆن من کەڵك لە ئاخاوتن وەردەگرم ئەوانی تریش وەك من کەڵك لە ئاخاوتن وەردەگرن، ئەوا پێموایە بەڵگەیەکی سەلمێنەرم بەدەستەوەیە بەو ددەرئەنجامە بگەم، کە ئەوانیش وەك من خاوەنی زەینن* (ل٢١). دواتر چەند توانای ئەنجامدان

---

[1] -mechanistic explanation

[2] - signs natural

بۆ تاقیکردنەوە پێشنیار کراوە. بۆ نموونە دەتوانین (**نیشانەی گرێبەستی**)[1] نوێ دروست بکەین:

**دەزانم دەتوانم لەگەڵ هەندێکیان رێکبەکەوم، چونکە ئەوەی بەشێوەی ئاسایی مانای شتێکە، واتایەکی تری هەیە و دەتوانین بەو ئاکامە بگەین، تەنیا ئەو شتانە بوونیان هەیە، کە ئێمە پەسندمان کردوون و وێدەچێ ئەوەی لە هزری من دایە، دەیبیستم. (ل٢٢-٢٣).**

بەم پێیە چەندین بەڵگەش دەخرێنە روو:

**کاتێك دەبینم ئەم بوونەوەرانە نیشانەی ئەو تۆ وەدی دێنن، کە هیچ پەیوەندییەکیان لەگەڵ ئەو بارودۆخەی تێیدا بەسەر دەبەن، یا لەگەڵ پاشماوەکانی ئەو بونەنەوەرانەدا نییە. کاتێك دەبینم ئەم نیشانانە لەگەڵ ئەوانەی من بۆ لێکدانەوەی بیرو هزرەکانم دەیانخولقێنم گونجاون، کاتی وا هەیە دەبینم ئەم نیشانانە بیربڕوایەکی ئەوتۆ دەخەنە بەر دەمم، کە پێشتر لێیان بە ئاگا نەبووم و، جاری واهەیە پەیوەندییان بە هێندێك شتەوە هەیە کە من پێشتر لە زەینم داهەبووە. بەکورتی پەیوەندییەکی زۆر لە نێوان نیشانەکانی خۆم و ئەوانی تردا دەبینم. (ل٢٨و٢٩).**

یا بە شێوەیکی ئەوتۆ دەجولێنەوە وەك ئەوەی ( *دەیانەوێ بمخەڵەتێنن.* ل٣٠ و ٣١). لەم هەل و مەرجەدا، دوای ئەوەی چەند تاقیکردنەوەی لەم جۆرە بە دەرئەنجامی ئەرێنی دەگەن، (*ئاقڵانەتر ئەوەیە کە وابیربکەمەوە ئەوانیش وەك منن.* ل٢٩)

---

[1] - Convention sign مەبەست نیشانەی گرێبەستی زمانییە، گرێبەستی زمانی ئەو پەیوەنییە ئارەزوومندانەیە کە لە نێوان شکڵ و مانای وشەکاندا پەسند بکرێ.

ئەوەی لەسەرتاسەری ئەم نووسراوەدا بەرچاو دەکەوێ، جەخت کردنەوەیە لەسەر لایەنی داهێنەرانەی چالاکی زەینی. لە ئاکامدا:

**... ئەو بیر و هزرە نوێیانەی لەکاتی ئاخاوتن لەگەڵ مرۆڤکانی تر بە زەینمان دادێ، شایەتی ئەوەن بۆ هەرکامێکمان، کە ئەوانی تریش وەك ئێمە خاوەنی زەینن. (ل١٨٥)**

**... گرینگترین بەڵگە کە بۆتە هۆی ئەوەی وابزانین، زەین و جەستەی ئەو مرۆڤانەی لەگەڵ مندا دەدوێن، پێکەوە بەستراوەتەوە، ئەمەیە: زەین، زۆرجار بیروهزری جوان دەخاتە روو، کە پێشتر نەمانزانیوە و لە ئاکامدا ناچارمان دەکات بیرو باوڕەکانمان بگۆڕین...(ل١٨٧).**

**کۆردۆموا** چەندین جار دەڵێ: (**ئەو تاقیکردنەوانەی**) سنووورداری توانای میکانیکی دەردەخەن، هەرئەوانەن کە بۆ کردەی زمان بە تایبەتی ئەوەی ئێمە بە لایەنی داهێنەرانەی زمانی دەزانین، بەکار دەبرێن. لێرەدا باسەکانی کۆردۆموا، لەمەڕ بنەمای دەنگ و بەرهەمهێنانی کارایی زمان و میتۆدەکانی بەڵگەمەندی و رەنگدانەوە و بەهێز کردن، کە فێربوونی زمانی واقعی مرۆڤ ئاسان دەکەن، هەروەها ئەو سیستمە پەیوەندییە نازمانییەی ئاژەڵەکان، ناوبراو دەخزێنێتە ناو چوارچێوەی گریمانە دیکارتییەکان.

ئەوەی بۆ ئێمە گرینگە، جەخت کردنەوەیە لەسەر لایەنی داهێنەرانەی کردەی زمان و، جیاوازییە بنەڕەتییەکانی نێوان زمانی مرۆڤ لە لایەك، دەزگاکانی پەیوەندی کردن و کردەیی و هاندەری بونیادی ئاژەڵەکان، لەلایەکی تر، نەك هەوڵە دیکارتییەکان بۆ لێکدانەوەی تواناکانی زمان.

پێویستە ئەو خاڵە بایەخی پێبدرێ کە لە باسەکانی داهاتوودا، کەڵك لە بەڵگە هێنانەوە دیکارتییەکان وەرناگرین بۆ سنووردارکردنی روونکردنەوەی میکانیکی.

دیکارت ئەوەی کردە سەرمەشق کە دەبێ بوونی **ماکی بیرکردنەوە**[1] بە گریمانە دابنێین، تا بتوانین ئەو راستییانە شرۆڤە بکەین، کە لەبەر چاومان گرتوون. بە شێوەیەکی گشتی پێشنیاری ئەو پێچەوانەی ئەو بانگەشەیە، کە دەڵێ پێکهاتەی ئاڵۆزی جەستەی مرۆڤ، بۆ سەلماندنی توانا ئاڵۆزەکانی مرۆڤ بەسە. بەڵام ئەو بۆ سەلماندنی بۆچوونی خۆی ئەوەندە خۆی ماندوو ناکات (*لە راستیدا* ***دیکارت*** *و* ***کۆردۆموا*** *لە ریزی ئەو کەسانەدا بوون کە هەوڵیان دەدا نیشانی بدەن، دەتوانین رەفتاری ئاژەڵی وکردەوەی جۆراوجۆری مرۆڤ، بە کەڵك وەرگرتن لە گریمانەکانی پێکهاتەی جەستەی مرۆڤ روون بکەینەوە*). لە ناو ئەو کەسانەدا دەتوانین **لامیتری** ناوبەرین، کە بڕوای وابوو مرۆڤ خۆی ئاڵۆزترین ئامێرە. (*مرۆڤ و مەیموون و ئاژەڵە هەر هۆشمەندەکان، هەمان پەیوەندییان هەیە کە پاندۆڵی* ***هیگنیز*** *لەگەڵ کاتژمێری* ***جۆلین لڕوا*** *دا هەیەتی. ل١٤٠*).

بە بۆچوونی ئەو بە ئاسانی دەتوانین بیرکردنەوەش لەسەر بنەما میکانیکییەکان تاوتوێ بکەین. (من بڕوام وایە کە بیر کردنەوە لەگەڵ مادەیەکی رێکخراو، ناگونجاو نییە. بیرکردنەوە یەکێکە لە خەسڵەتەکانی مادە، وەك کارەبا، توانای جوڵان، **بەرگری**[2] و کشان و هیتر. ل١٤٣و١٤٤). کەواتە نابێ فێرکردنی مەیمون لەسەر قسەکردن، رووبەرووی گرفتێکی بنەڕەتی ببێتەوە. تەنیا رێگر (*کەموکوڕی ئەندامەکانی ئاخاوتنییەتی و دەتوانین ئەمەش بە راهێنی گۆنجاو لابەرین. ل١٠٠*). (*گۆمانی تێدانیە ئەگەر دەکرا ئەم ئاژەڵە بخریتە بەر راهێنانێکی گونجاو، لە کۆتایی دا دەکرا گۆکردنی دەنگەکان ئینجا بە دوای ئەودا زمانێك فێر ببێت،*

[1]-thinking substance

[2] - impenetrability

*ئەوسا ئەو ئیتر مرۆڤێکی درِندە یا کەمئەندام نەدەبوو، بەڵکو دەبوو بە مرۆڤێکی نەك هەر کامڵ بەڵکو کەسێکی وەك ئەریستۆکرات. ل١٠٣)*. بەم پێیە دروستکردنی ئامێرێکی ئاخێوەریش لە زینی بە دوور نەدەبوو. (***ڤۆکانسن* ١٧٠٩-١٧٨١** *کە بۆ دروستکردنی ئامێرە فلوتژەنەکەی، ناچار بوو لێهاتوویەکی پتر لە دروستکردنی مراویەکەی بخاتە گەڕ، ئەگەر بیویستبا ئامێرێکی ئاخێوەر دروست بکات، ئەو ئامێرەی کە ئێستا دروستکردنی مەحاڵ نییە، تەنیا پێویستی بەوە بوو برێکی تر شارەزایی خۆی بەکار بێنێ. ل١٤٠و ١٤١)*

**بوژان** چەند ساڵ پێش بڵاوکردنەوەی مرۆڤی ئامێری لە یەکێك لە بەرهەمە بەرِواڵەت نیمچە جدجییەکانی خۆی دا، هەوڵیدا تا لێدانەوەکانی **دیکارت** رەتکاتەوە، لەمەڕ سەلماندنی ئەوەی کە زمانی مرۆڤ و زمانی ئاژەڵ لەیەکتر جیاوازن. کەچی لێکدانەوە بە ڕواڵەت پێچەوانەکەی ئەو، جەختی لەسەر بۆچوونەکانی دیکارت کردەوە لەبارەی زمانی مرۆڤ و زمانی ئاژەڵ. بانگەشەی سەرەکی ئەو، (*ئاژەڵەکان وەك ئێمە تەنانەت زۆرجار لە ئێمە باشتر، لەگەڵ یەکتر دەدوێن و وتەکانی یەکتر دەبیستن. ل١٤)*، لەسەر ئەم بنەمایەیە کە دەتوانین ئاژەڵەکان رابێنین، تا کاردانەوەیان بۆ چەند نیشانەی تایبەتی هەبێ، ئاژەڵەکان هەستە جۆراوجۆرەکانی خۆیان بە چەند هیمای دەرەکی دەردەبڕن، هەروەها بە شێوەی کۆمەڵ کاردەکەن (*وەك سەگلاوك، ئەو دەڵێ سەگلاوکەکان زمانیان هەیە، لەگەڵ* ***گەمە زمانییەکان*** *دا، کە بە پێی بۆچوونی* ***وتگشتاین*** *شێوازی سەرەتایی زمانی مرۆڤە، خاڵی هاوبەشیان زۆرە)*. لەگەڵ ئەمەشدا ئەو (*تێگەیشت کە زمانی ئاژەڵەکان تەنیا لە دەرخستنی هەستەکان و هەڵچوونەکانیاندا چڕ دەبێتەوە و، دەتوان هەموو هەست و هەڵچوونەکانیان لە چەند نیشانەیەکی دیاری کراودا کورت*

*بکەنەوە. ل١٥٢ )*. (*ئاژەڵەکان دەبێ بەردەوام یەك دەستەواژە دووبارە بکەنەوە، ئەم دووبارە کردنەوەیەش ئەوندە درێژە دەکێشێ، کە هەموو زەینی ئەوان بە خۆیەوە خەریك دەکات. ل١٢٣* ) ئەوان واتە ئاژەڵەکان هیچ جۆرە بیر و هزرێکی ئەبستراکت یا فەلسەفیان نییە:

**ئەو زانیارییانەی ئەوان هەیانە، بەتەواوی لە بابەتی هەنوکە و مادی دا کە هەستەکانی ئەوان دەجوڵێنێ، سنووردارکراوە. مرۆڤ کە خاوەنی زمانێکی لە رادەبەدەر بێ هاوتایە و خاوەنی بیرو بڕوای بڵندە، ناتوانێ وتەکانی خۆی بە بێ زاراوە و راناوە کەسییەکان و راناوەکانی پەیوەندی دەربڕێ و کارایی وتەکانی دیاری بکات.** ل١٥٦

لە راستیدا  ئاژەڵەکان تەنیا بۆ (*ئەو هەستانەی هەستی پێدەکەن.* ل١٥٥) ناوی جۆراوجۆریان هەیە و ناتوانن (*وەك ئێمە دەستەواژەیەکی شەخسی یا پێکهاتەیەك دروست بکەن.* ل١٥٦)

**بۆچی سروشت، توانای ئاخاوتنی بە ئاژەڵەکان بەخشیوە؟ هەر لەبەر ئەوەی ئارەزوو و هەستەکانی خۆیان بۆ یەکتری دەربڕن و، بتوانن لەم رێگەیەوە بە نیازەکانی خۆیان بگەن و، ئەوەی ویچدەچێ بۆ مانەوەیان پێویستە، دەستەبەری بکەن. دەزانم کە زمان ئامانجێکی تریشی هەیە، ئەویش دەربڕینی بیرو بۆچوون و بڕواو زانیاری و لێکدانەوەکانییەتی. بەڵام ئاژەڵەکان دەزگایەکیان هەیە مەعریفە (شناخت)... گومانی تێدا نییە کە سروشت تەنیا یەك مەعریفەی بە ئاژەڵەکانی داوە، کە بۆ پاراستنی جۆر و تاك تاکی ئاژەڵەکان بەکەڵك و پێویستە. لە ئاکامدا ئاژەڵەکان هیچ جۆرە لێکدانەوەی ئەبستراکت و وەرگیراویان نییە، هیچ کاتێك توێژینەوەیەکی پشکێنەرانە لە سەر ئەو شتانەی دەوروبەریان ئەنجام نادەن ، و هیچ زانستێکیان نییە تەنیا ئەوەنەبێ کە چۆن تەندروستی خۆیان بپارێزن، پارێزگاری لە خۆیان**

**بکەن، لە هەرشتیك مەترسی هەبێ بۆ سەریان دوور بکەونەوە و خـۆراکی خۆیـان بەدەسـت بێنن. هەرگیز نەبینراوەئاژەڵەکان لە کۆمەڵدا وتارێك بدەن، یا لە بارەی گرفتی کاروبارەکانیان و کاریگەرییان، بدوێن.** ل٩٩و ١٠٠)

کورتی وتە ئەوەیە، زمانی ئاژەڵەکان لە چوارچـێوەی **روونکردنـەوەی میکـانیکی** دایە، ئەمەش هەر ئەوەیە کە **دیکارت** و **کۆردۆموا** وتویانە.

بەرواڵە نە **لامیتری** نە **بوژان** سەرنجیان بۆ لای ئەو خاڵە نەچووە، کە **دیکارت** باسی کردووە، ئەو خاڵەی کە بەرهەمی لایەنی داهێنەرانەی زمانە، واتە ئەم دیفاکتۆیە، کە زمانی مرۆڤ بە دوورە لە کـۆنترۆڵی بزوێنـەرە دەرەکییـەکان و هـەل و مەرجـە فیزیۆلۆجییـەکانی دەروونـی، هـەروەها ئـامێرێکی هەمەکییـە بـۆ بیرکردنـەوە وخۆدەربڕین، نە تەنیا بۆ گوزارشت و داواو فەرمان دان[١]. توێژینـەوە نوێیـەکان بـۆ روون کردنەوەی رەفتاری هۆشمەندانە، لە توێژینەوەکانی پێشـوو پەسـندتر نـین. بـۆ نموونە **رایل**، لە رەخنە گرتن لە **ئوستورەی دیکارت** بەگشتی لە خستنە رووی ئـەم پرسە خۆی بە دوور دەگرێ. ناوبراو دەڵێ دێکارتییەکان لـە بـری ئـەوەی بـە دوای تاوتوێ کردن و روون کردنەوەی رەفتاری هۆشمەندانەدا بگەڕێن، دەبوو (*بپرسـن کـە پێوەری لێکجیـا کردنـەوەی رەفتـاری هۆشمەندانـە و ناهۆشمەندانـە چـییە*؟ ل٢١). ئەگەر ئەم راو بۆچوونانە بە باشی پەیان پێ ببرێ کۆکردنەوەیان مەحاڵ نییـە. ئـەو پێوەرانەی **رایل** دەیانخاتە بەردەم، لە بنەمادا جیاوازییـەکی ئـەوتۆیان لەگـەڵ ئـەو تاقیکردنەوانە نییە، کە **کۆردۆموا** پێشنیاری کردبوون. لـە کاتێکـدا **رایـل** تـەنیا

[١]- ئەمەش بە مانای نکۆڵی کردن نییە لەم بابەتە، کە رێبازی **لامـیتری** لـە راسـتیدا راسـت نییـە. ئـەوەی پەیوەندی بە منەوە هەیە، تاوتوێ کردنی تەواوی روونکردنەوەی پێشنیار کراوی **دیکارت** و ئەوانی تـر نییـە، بەڵکو بۆچوونی ئەوانە لە بارەی زمانی مرۆڤ، کە بۆتە هۆی ئەم لێکدانەوانە.

باسی ئەم واقعیەتەی دەکرد، کە رەفتـاری هۆشمەندانـە ئاکـاری تایبـەتی هەیـە[1].
دیکارتییەکان لەبەر بێ تواناییان لەمەڕ روون کردنەوەی میکانیکی، پتر خـەریکی سەلماندنی ئەم جۆرە رەفتارەن. ئێمە زەحمەتە بتوانین بانگەشەی ئەوە بکەین بڵـێین: لە دیاری کردنی تایبەتمەندییەکانی رەفتاری هۆشمەندانەدا، میتۆدەکانی دەسـتەبەر کردنی ئەو رەفتارانە، ئەو بنەمایانەی زاڵـن بـە سـەریاندا، چـۆنییەتی پێکهاتـەی بنەڕەتییان، لە سەدەی حەڤدەهەم لە پێشترین. دیارە دەتـوانین ئـەم پرسـانە لەبـەر چاو نەگرین، وەلێ تائێستا هیچ بەڵگەیەکی بەهێز نەهاتۆتـە ئـاراوە بڵـێ ئەمانـە ناواقعین، یا لە سنووری تاوتوێکردنی ئێمە بەدەرن.
زمانناسی نوێ هەرگیز راو بۆچوونەکانی دیکارتی لەمەڕ زمان، بە جیـدی تـاوتوێ نەکردووە. بۆ نموونە **بلۆمفیلد** تێگەیشت کە زمانی سروشتی *(توانای ئاوێتە بوونی پراکتیکی بێ سنووری هەیە)*، کەواتە ناتوانین کەڵك وەرگـرتن لـە زمـان، لەسـەر بنەمای دووبارە کردنەوە یا پێرستێکی کەرەستە زمانییەکان پێناسە بکـەین. وەلێ ئەو لەم پرسەدا تەنیا بەو وتەیە وەستاوە کە وتەبێژ، شێوازی نوێ *(لەسەر بنـەمای بەراورد یا شێوازی هاوشێوە کە پیشتر بیستویەتی)*[2] دروست دەکـات. **هاکـتیـش** ئاخێوەر، ئەو کاتە شێوەکانی گوتار بەرهەم دێنێ کە تا ئێستا نەیبستووە (دەڵێین ئەو بە بەراوردکردن لەگـەڵ ئەو گوتەزا هاوشێوانەی پێشتر بیستوویەتی، وتەکانی بەرهەم دێنێ)، لە روانگەی **بلۆمفیلد**ەوە، زمانی مـرۆڤ جیاوازییەکی زۆری نییە لەگەڵ سیسـتمی پەیوەندییـەکانی ئـاژەڵان و، تاکـە جیـاوازی نێوانیـان (خەسـڵەتی گرینگ) زمانی مرۆڤە. لەم جیاوازییە بەلاوە، کردەوەکانیان هاوشێوەیە. (مرۆڤ کۆمەڵێك دەنگـی جۆراوجـۆر بەرهەم دێنێ و بە گەلێك رێباز کەڵك لەم فرەجۆرییە وەردەگرێ: لەژێر کاریگەری بزوێنەری تایبـەتی، دەنگـە

---

[1] - ئەمانە لەسەر بنەمای **توانا** و **ئارەزوو** و **رێکخستن** لێکدانەوەیان بۆ کـراوە، تـەنیا بـە هـۆی نموونەگـەلی پەراگەندەوە دیاری کراون. ئەمانە ئوستورەی نوێیان دروستکردووە کە وەکو **ماکە زینییەکەی** دیکارت لێـڵ و ناروونە.

[2] -L. Bloomfield, Language, New Yourk, Holt (1933) p 275.

هەروەها بە هەمان شێوە بە تەواوی داهێنان دەبەستێتەوە بە بەراورد. **پال**، **سۆسۆر**، **یسپرین**، و کەسانی تریش هەمان بیرو بۆچونیان هەیە. بۆ بەستنەوەی لایەنی داهێنەرانەی زمان بە **بەراوردکردن** analogy[1] یا **نموونە دەستوورییەکان**ەوە، بە شێوەیەکی تەواو خوازراوە کەڵك لەم دەستەواژانە وەرگیراوە، بێ ئەوەی تێگەیشتنێکی روونیان هەبێت و پەیوەندییان لەگەڵ تیوری زمانی (بە تێگەیشتنە هونەرییەکەی)،دیاری کرابێ. ئەم گوزارانە ئەوەندەی لێکدانەوەکەی **رایل** ناروونن، کە ئەنجامی داوە بۆ رەفتاری مرۆیی لەسەر بنەمای بەکارهێنانی جۆرێکی ناروون لە **دەسەڵات** و **تواناکان**، یا هەوڵدان بۆ کەڵك وەرگرتنی ئاسایی داهێنەرانە لە زمان، لەسەر بنچینەی **گشتگیرکردن** یا **خوو** یا **مەرجدار بوون**. بەکارهێنانی ئەم زاراوانە لە لێدواندا، ئەگەر بە مانای هونەری

---

گوتارییەکان بەرهەم دێنێی و گوێگرەگانی دوای بیستنی ئەو دەنگانە کاردانەوەی گونجاو نیشان دەدەن. ل٢٧). ئەو بڕوای وایە کە (زمان لە بنەڕەتدا پرسێکە پەیوەندی بە فێرکردن و خووخدەوە هەیە. ل٣٤) و بە تاوتوێ کردنی وردی ئاماری (دەکرێ بی هیچ گومانێك بڵێین، کە وتەیەکی تایبەتی، چەند جار لە چەند رۆژی دیاریکراودا دوبارە دەکرێتەوە. ل٣٧). (ئەو دەرئەنجامە تەواو راستە، چونکە بۆ زۆربەی وتەکان ژمارەی پیشبینی دەبێتە سفر.)

[1] -C. F. Hockett, A Course in Modern Linguistics, New York, Macmillan 91958). P 36, 50

**هاکت** وەبیرمان دێنێتەوە کە (دەڵێین کاتێك کەسێك دەدوێ، یا لاسایی کردنەوەیە یا بەراوردکرن). ئەو ئەم رایە قبوڵ دەکا و دەڵێ: (کاتێك ئێمە بەدرێژی دەدوێین، راستەوخۆش وتەکە ناگوێزینەوە، بە دڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین بەراوردکردن لەکار دایە.ل٤٢٥). رای ئەو لە ناو زماناسان نائاساییە، چونکە لانیکەم قبوڵی دەکا کە ئەم بۆچوونە هەڵەیکی تێدایە.

وێدەچێ ناوبراو لە باسی داهێنانی زمانیی دا، بەشێوەیەکە دەڵێ، گوزارەی جوان تەنیا بە پەیوەندی لەگەڵ تۆڕی وتەکە، پەی پێدەبرێ. ل٣٠٣). لە راستیدا پشتگوێ خستنی میکانیزمی زمانیی، کە مانای رستەی ئاسایی و زۆرجار نوێ، لە زمانی رۆژانەدا دیای دەکات، لایەنی دیاری زمانناسی نوێیە.

خۆیان بەکار نەبرێن هەڵەیە، ئەگەر هەوڵ بدرێ ئەوتوایانەی باسیان لێوە دەکرێ لە ئاستی **حاڵەتێکی ئاڵۆزتر** لەوەی کە ناسراوە لەبەرچاو بگیردرێ، ئەوا رێ بزرکەرن. بینیمـان کـە روانگـەی **دیکـارت**، کـە بـەهۆی **دیکـارت، کۆردۆمـوا**، و دژە دیکارتییەکان وەك **بوژان** روون کراوەتەوە، ئەمەیە: کە زمـانی مـرۆڤ لـە حاڵـەتی کەڵك لێوەرگرتنی دا، بە دوورە لە دەسەڵاتی بزوێنەرە دەرەکییەکان و تـەنیا رۆڵـی پەیوەندی ناگێرێ، بەڵکو ئامرازێکە بۆ دەربڕینی ئازادانەی هـزر و کـردەی گونجـاو لە هەل و مەرجی نوێدا[1]. هەروەك دواتر دەبینین کە ئەم رایانە لەمـەڕ ئـەوەی کـە ئێمە ناومان ناوە لایەنی داهێنەرانەی زمان، لـە سـەدەی حەڤدەهـەم و سـەرەتای سەدەی نۆزدەهەمـدا، بـە درێـژی شـرۆڤە کـراون. هاوکـات ئـەزموونی دووەمـی **دیکارت،** بۆ دیاری کردنی ئەوەی کە ئایا ئامێری خودکار هەمان **مرۆڤی واقعیی**ە لە چوارچێوەی **زنجـیرەی گـەورەی بوونـدا***. سـەرلەنوێ لێکدانـەوەی بـۆ کـراوە؟. **دیکارت** جیاوازییەکی گەورەی لە نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ دا داناوە و دەڵـێ: رەفتـاری ئاژەڵ لە سەر بنـەمای غەریزەیـە و تێکـڕای نیشـانەی تایبـەتی غـەریزەکان، لـە چوارچـێوەی لێکدانـەوەی میکـانیکی دا، دادەنـێ. روانگـەی دیـاریکراوی دواتـر ئەمەیە: هۆش چەند پلەی هەیە و لە نێوان کاملێی غەریزەکان و توانای زەینـی دا پەیوەندییەکی پێچەوانە لە ئارا دایە. بۆ نموونە بە بۆچوونی **لامـیتری** (*تـا هۆشـی تاك پتر دەبێ (لە چوارچێوەی روح دا) لە غەریزەکانی کەم دەبێتەوە*. ل٩٩) یاسای هاوبەشی سروشتە.

---

[1] - لێکۆڵینەوە نوێیەکان لەمەڕ جیاوازی زمانی مرۆڤ و دەزگای پەیوەندییەکانی ئاژەڵان، زۆرجار بە هـەمان دەرئـەنجامی دیکـارت دەگـات. بـۆ نموونـە بڕوانـە: L. Carmichael, "The early Growth of Language in the individual" in Lenneberg (ed) op, cit.

* - Great chain of bing

**هێردر** دوو ئەزموونی دیکارتی **هەبوونی زمان** و **فرەجۆری کردەوەکان**[1]، لە وتارێکدا دەربارەی سەرچاوەی پەیدابوونی زمان، بە شێوەیەکی جوان، پێکەوە بەستراو لەقەڵەم داوە. ئەویش وەك **دیکارت** بەڵگە دێنێتەوە کە زمانی مرۆڤ لەگەڵ ئەو دەنگ و ئاوازانەی لە هەستەکانەوە دێن جیاوازە و ناکرێ بگەڕێنرێنەوە بۆ ئەندامەکانی تری پلەبەرزی دەنگسازی. هەروەها ناتوانین لە لاسایی کردنەوەی سروشت، یا لە یەکسانی زماندا، بۆ رەگ و ریشەکانیان بگەڕێین[2]. چونکە زمان موڵکی سروشتیی مرۆڤە. بەڵام سروشت مرۆڤی چەکدار نەکردووە، بە زمانی غەریزی یا توانای غەریزی زمان یا تواناکانی بەڵگە هێنانەوە، کە زمان رەنگدانەوەی ئەوبێ. بە پێچەوانەوە، تایبەتمەندی بنەمایی مرۆڤ، لاوازی غەریزەیە. مرۆڤ لە رووی غەریزەکانەوە لە ئاژەڵ زۆر لاوازترە. بەڵام غەریزە و ناسك هەستی و شارەزایی ئێمە، بە سنووری ئاسۆ و پانتایی ژیان و ئەزموونی ئێمەوە بەستراوەتەوە. مانای هەموو توانای تێگەیشتن و نواندنی ئێمە، لە ناوەندێکی گچکە و دیاری کراودا چڕبۆتەوە. (ل١٦و ١٧). دەتوانین ئەم وتەی ژێرەوە بە بنەمایەکی گشتی ئەژمار بکەین: (*هەستەکان، تواناکان، چالاکییەکان و پاڵنەرە جێنێتیکییەکان ئاژەڵەکان کە تێیاندا بەهێز دەبێ و پاتایی و قووڵایەکی پتر وەخۆ دەگرن، لە گەڵ ئەندازە و فرەجۆری بازنەی کردەوەکانیان پەیوەندییەکی رێژەیی پێچەوانەی هەیە. ل١٦ و ١٧*) بەڵام تواناکانی مرۆڤ بەربڵاوتر و

[1]-possession of language, diversity of actions 

[2]- ئەم خاڵە لەمەڕ گەشەکردنی زمان لە تاکیشدا، راستە. تاوتوێکردنی **سەرچاوەی زمان** لە راستیدا تاوتوێکردنی **ماکی زمانە**. لەم لایەنەوە نیشانەکانی گەشەکردنی زمانی تاك لە ناو خەڵکدا زۆرجار بە هاوئاڕاستە دادەنرێ. بڕوانە:

A. W. Schlegel, Die Kunstleher (1801: Stuttgat, W. Kohlhammer Verlag, 1963 p 234) 

جۆاوجۆرترن. (*مرۆڤ کەش و هەوایەکی ئاوا دیاری کراو و تاك رەهەندی، کە تەنیا یەك کاری تێدا ئەنجام دەدرێ، لەبەر دەست دانییە*. ل١٧) بە وتەیەکی تر، لە ژێر دەسەڵاتی بزوێنەرە دەرەکییەکان و و پاڵنەرە دەروونییەکاندا نییە و، پێویست ناکات بە تەواوی و شێوەیکی دیاری کراو کاردانەوەی هەبێ. ئەم ئازاد بوونە لە کۆتی غەریزە و بزوێنەرەکان، بنەمای ئەو شتەیە کە ئێمە ناوی دەنێین **ئەقڵی مرۆیی**: (*ئەگەر مرۆڤ خاوەنی بزوێنەری ئاژەڵی با، نەیدەتوانی ئەو شتەی هەبێت کە ئێستا ئێمە پێی دەڵێین* ***ئەقڵ****. لەبەر ئەوەی ئەم بزوێنەرانە، بەشێوەیەکی ئەوتۆ هێزەکانی مرۆڤ بەرەو تاریکایی دەبەن، تواناکانی تایبەت دەکەن بە ئاراستەیکی دیاری کراو، کە ئیتر ئازادی بیرکردنەوەو و تێگەیشتن بۆ ئەو مانەکی نەمێنێ*. ل٢٢). بە راستی هەر ئەم لاوازییەی غەریزەکانە بە ئیمتیازێکی سروشتی مرۆڤ لەقەڵەم دەدرێ و دەیکاتە **بوونەوەرێکی ئەقڵگەرا**[1]. ئەگەر مرۆڤ وەك ئاژەڵ بەستراوە و پابەند بە غەریزەکانی نەبێ، دەبێ بە بەهرەی هێزی ئازادی دەروونی خۆی، بوونەوەرێکی وریا بێ ل٢٢). بۆ قەرەبوو کردنەوەی ئەم لاوازیی غەریزەیە و تێگەیشتن، مرۆڤ خاوەنی (*هەستی بەرزراگرتنی ئازادییە* ل٢٠). ئەم هەستە (*وەك ئامێری بەدوور لە هەڵە لە سروشتی ئەودا نییە، بەڵکو ئەو خۆی نیاز و ئامانجی ئەم ئازادیەیە*. ل٢٠)

مرۆڤ لە بیرکردنەوەی ژیرایەتی دا ئازادە، و دەتوانێ ببینێ، بەراورد بکات، تایبەتمەندییە سەرەکییەکان لێکجیا بکاتەوە، شتەکان بناسێ و ناویان لەسەر دابنێ. ل٢٣) لەم چەمکەدایە کە **زمان** و **دۆزینەوەی زمان** بۆ مرۆڤ سروشتی و زاتییە ل٢٣). و(مرۆڤ بە شێوەیەکی وا پەروەردە بووە کە خۆی خولقێنراوی

---

[1] -rational being

دەستی زمانە. ل٤٣). لە لایەکی تر **هێردر** تێگەیشت، کە مرۆڤ بە شێوەی جێنێتیکی خاوەنی زمان نییە، واتە *ئاخاوتن لە مرۆڤدا زگماکی نییە*. لە لایەکی تر، بە بۆ چوونی ئەو زمان بەم شێوەیە، لە دایك بووی تایبەتمەندی پێکهاتەی زەینی زمانە، کە ئەو توانی بڵێ (*ئێستا من دەتوانم هەموو نیازەکانم پێکەوە گرێ بدەم و بە تاڵێکییەوە بکەم ببینرێ، ئەو تاڵەی کە ئێمە ناوی دەنێین سروشت و سروشتی مرۆیی، نەك ئەو تاڵەی کە تەنیا بە هۆی زمانەوە خزاوەتە ناو سروشتی ئێمە*). ئەو ئەم پێکناکۆکییە رواڵەتییەی بەم شێوەیە چارەسەر کرد، کە زمانی بە دەرئەنجامی لاوازی **غەریزەکانی مرۆڤ**[1] دانا.

**دیکارت**، ئاقڵمەندی مرۆڤی (*ئامرازێکی هاوبەشی گشتییە کە بۆ هەموو کاروبارەکان بەکاردێ*)، هەروەها بە بنەمای فرەچەشنی بێ سنوور وئازادانەی بیرکردنەوە و کارکردن دەزانێ[2]. **هێردر** ئاقڵمەندیی، بە توانای زەینی ئەژمار ناکات، بەڵکو بە ئازادبوونی دەزانێ لە دەسەڵاتی بزوێنەرەکان و، هەوڵدەدا دەری بخات کە چۆن ئەم **خەسڵەتە سروشتییە**[3]ی پەرەسەندنی زمان لە مرۆڤدا دەکاتە شتێکی شیاو و - لە راستیدا پێویست - (ل٢٥) .

---

[1] -human instinct

[2] - دیکارت زمان لە واتای تایبەتی خۆیدا، بە کردەوەی ئەقڵی رووت نازانێ، بۆ نموونە بڕوانە:
Principle of philosophy, CXCVII (Haaldane & Ross, p 296) دەبینین، زاراوەی وتراو یا نووسراو، لە زینی ئێمەدا جۆرێك هزرو هەست دەبزوێنێ... دەتوانێ وشەگەلێك یەك لە دوای یەك ریز بکات، تا لەزەینی خوێنەراندا بیرو رای جەنگ، تورەیی خوێنرشتن بوروژێنێ، یا هەستی دڵتەنگی و بێ رێزی، خۆ ئەگەر پێنووسەکەمان بەلایەکەی تردا برەتێنین، ئەوا، بیروڕای تەواو جیاواز سەرهەڵدەدەن، وەك بیرو هزری ئارامی، ئاشتی، بەختەوەری، ئەوین و شادی.

[3] -natural advantage

کەمێك پێش **هێردر**، **جیمیز هاریس** ئەقلانییەتی هاوشێوەی **هێردری** راڤە کردووە. بەم مانایە کە بە ئازادبوون لە دەسەلاتی غەریزەی دەزانێ، نەك توانا دیاری کراوەکان. **هاریس** وەك لە ژێر ئەم دەقەی خوارەوەدا دەیبینین، جیاوازی داناوە لە نێوان **ماکی مرۆڤ**[1] کە ناوی دەنێ **ئەقڵ** و **ماکی ئاژەڵ**[2] کە ناوی دەنێ **غەریزە**:

**کەواتە...سەرنج بدەنە جیاوازی نێوان هێزی مرۆیی و ئاژەڵیی، وا دەردەکەوێ لە هەر ئاژەلێکدا، ئارەزووی بەرەو یەك ئامانج هەبێت، بە گشتی ئاژەڵ بە هاوئاهنگییەتی تەواو، بەرە و ئەم ئامانجە دەروات و هەر لەم ئامانجەدا دەوەستێ. ئەو پێویستی بە هیچ بڕیار و فەرمانێك نییە و بە ئاسانی ناگۆڕدرێ و رێرەوێکی تر ناگرێتەبەر. بە پێچەوانەوە، ماکی مرۆڤ لە توانایدایە، چەندان رێڕەوی لە رادەبەدەر جۆراوجۆر هەڵبژێرێ: ئامانجەکانی دەگۆڕێ، جۆرەها بابەت لای ئەو یەکسانە و ئەگەر لێگەڕێی هەر بۆخۆی بێ و بەس، ئەوا رووت دەبێتەوە لە کەماڵ و تێگەیشتن، بەلام لە کاتی گەشەکردن لەگەڵ زانست و هونەردا، پوختە دەبێ و دەتوانێ بە پلەی کەماڵ واتە ئەقڵ و تێگەیشتن بگات. تەنیا ئێمەی ئادەمیزاد ئاواین. هێز و توانایەکانی تر، دەتوانن لە بەکارهێنانیان و توانا سروشتییەکانی دەوروبەرمان، یارمەتیمان بدەن. دەتوانین دووی هێزی پێچەوانەی یەکتر لە وتەیەکدا، بەم شێوەیە شرۆڤە بکەین: خودی ماکی مرۆیی فرەچەشن، رانەهێنراو، وەرچەرخێن[3] و ملکەچە، بەلام ماکی ئاژەڵ، یەك جۆر، ئامانجدار و لە زۆر حاڵەتدا وەرنەچەرخێن و سەرکێشە.**

---

[1]- لە دقە فارسییکەدا **جەوهەری مرۆڤە**.

[2]- Brutal Principle کە بەرامبەرەکەی بنەمای درندەییە. و/ کوردی

[3]- مەبەست ئەوەیە دەتوانێ بگۆڕدرێ لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی تر یا ئاڕاسەکەی بگۆڕی یا گۆڕانکاری بەسەر دابێت و/ کوردی.

کەواتە دەتوانین بڵێین: ***مرۆڤ بە شێوەی سروشتی ئاژەڵێکی ئاقڵە*** بەو مانایە کە لە ژێر کۆنترۆڵی غەریزەکان دا نییە[١].

خولیای لایەنی داهێنانی کردەوەی زمـان سـەبارەت بـە پرسـی گشـتی داهێنـانی راستەقینە، بەمانای تەواوی وشەکە، بە درێژایی قۆناغی رۆمانتیکی بەردەوامـە[٢].

---

[١]- وێدەچی **هاریس** لەم باسەدا بێ هێچ بەڵگەیەك، ئەم گریمانەیە کـە نموونەیـەك لـە شـێوەی مـۆدێرنی ئـەم تیورییە، لەبەرچاو بگرێ، لەبەر ئـەوەی مـرۆڤ توانـای هەڵبـژاردنی **زۆر رێگـای** هەیـە، کەواتـە بەتـەواوی وەرچەرخان قبوڵ دەکات، بەواتایەکی تر تا رادەیەك تواناکانی زەینی مرۆڤ کۆنترۆڵ دەکات. ئەم گریمانەیە هیچ پەیوەندییەکی نییە، بە بڕوای ئازادبوون لە فەرمانی غەریزەکان، نیازەکان، پانتاییەکی بـێ سـنووری توانـا و زانستە شاراوەکان. **هاریس** بەم گریمانە سەربەخۆیە بە تەواوی دەکەوێتە دەرەوەی بیرکردنەوەی **دیکارتی**.

**هاریس** لە شوێنێکی تردا، رای بە شێوەیەك دەردەبڕێ کە دەکرێ سەرنجێکی تەواو جیاوازی لێوەربگرین. ئـەو لە باسی پەیوەندی نێوان بلیمەتی داهێنەرانە و یاسـاکان ( philogical Inquiries, 1780 in works vol. III )، ئەم بۆ چوونە رەت دەکاتەوە:

بلیمەتیی پێشەنگی دەزگایە، هەروەها پێشەنگی رێساکانیشە، (هەر وەك یەکـەی کـات و شـوێن لـە تیـوری نواندن دا)، لەبەرئەوەی یاساکان لە سەرەتاوە لە خۆیانەوە هەبوون، و بەشێك لەو راستییە نەگۆڕە بوون کە بـۆ هەموو کات **و شوێنێکە.(ل٤٠٩).**

بلیمەتیی و رێساکان (ئەوەندە پێکپەیوەستن کە بلیمەتیی لە یاساکان **کە نائاگایانە لە زەین دا هەن** دەگات و دواتر یاساکان فەرمانڕەوایی بەسەر بلیمەتیی دا دەکەن)

[٢]- ناتوانین لەبەر نوێیی، یـا سـەربەخۆیی لـە بزوێنـەر یـا پاڵنـەرە شەخسـییەکان، **کـار** (فعـل) نـاو بنـێین (**داهێنەرانە**). کەواتە گوزارەی **لایەنی داهێنەرانەی کەڵك وەرگرتن لـەزمان**، بـێ لێکدانـەوەی تایبەتمەنـدی زمانی رۆژانە، کە **دیکارت** و **کۆردۆموا** بایەخیان پێ دابوو، زۆر گونجاو نییە.

زۆرباشە بزانین کە **گالیلۆ** دۆزینەوەی میتۆدەکانی گواستنەوەی (شاراوەترین بیرو هزرەکانی مرۆڤ بـۆ کەسـانی تر... کە بە ئاسانی لە رێگەی ریکخستنی (٢٤) نیشانەی وردەوە (ئەلفابێت)لە سەر کاغـەز ئـەنجام دەدرێ) ناوی نا گەورەترین داهێنانی مرۆڤ و، تەنیا بە شیاوی ئەوەی دەزانی لەگـەڵ دەسـکەوتەکانی **مایکـل ئانـژ** و **رافائیل تیسین** بەراورد بکرێ.

(Dialogue on the greate world system. 1630, university of Chicago press. 1953. pp116-117) گەڕانەوە بۆ کتێبی **دەستووری هاوبەشی گشتی و سەلماندن** لەگەڵ ئەم وتەیە بەراورد بکە:

تیورییەکانی **أ . و .شلگل** لە کتێبی **زانستی هونەر** دا لە بارەی زماندا، لێکدانەوەیکی تایبەتی بەم دەسکەوتانە بەخشیوە. ئەو باسەکەی لە سەر زمان لێرەوە دەسپێدەکات، کە وتە پەیوەندی بە ئامانج یا بزوێنەری دەرەکییەوە نییە. وشەکانی زمان لە بێژەر و بیسەردا، وێناکردنی ئەو تۆ دەربارەی شتەکان دەخولقێنن، کە ئەوان خۆیان پەیان پێنەبردووە، بەڵکو لە ڕێگەی لێکدانەوە هەستیان پێکردووە، وەیا (*ئەم ویناکردنانە ناکرێ لە ڕێگەی هەستەکانەوە پەیان پێ ببرێ، چونکە لە دنیای روحی و مەعنەوی دا بوونیان هەیە*). هەروەها زاراوەکان دەتوانن تایبەتمەندی ئەبستراکت (رووت) و پەیوەندییە ئەبستراکتەکانی نێوان بیسەر و بێژەر، بابەت و وتە، وەیا پەیوەندی نێوان کەرەستەکانی ئاخاوتن بە گوێگر بگەیەنن. ئێمە بۆ شێوە بەخشین بە ***وێناو بیرۆکەکان*** مان، وشەی ئەو تۆ بەکاردێنین کە (*روونکردنەوە و مانای ناسك و جوانیان هەیە، تەنانەت فەیلەسوفەکانیش تووشی سەرسوڕمان دەکات*). بەم حاڵەشەوە کەسانی بێ هۆش و زانیاری، بە ئازادی کەڵك لەم وشانە وەردەگرن:

**ئێمە بۆ ئاخاوتن تێکڕای ئەم وشانە لێکدەدەین. ئامانج لە وتە تەنیا ئەوە نییە، لەبارەی مەبەستی خۆمانەوە هەواڵ بە بەرامبەرەکەمان بگەیەنین، بەڵکو یارمەتی مان دەدات قووڵترین حاڵەتی سۆزداری و هەستیاری خۆمان نیشان بدەین. بەم پێیە ئێمە ئارەزووی جۆراوجۆر دەسنیشان دەکەین و بڕیارە ئەخلاقییەکانمان پتە و دەکەین، یا لەناویان دەبەین و**

---

ئەم پێڕستە سەرسوڕهێنەرە بە کەڵك وەرگرتن لە ٢٥ تا ٣٠ دەنگ، وشەگەلێکی بێ سنوور دەخولقێنێ، وشەی ئەوتۆ کە نە لێکدەچن و نە ڕێگە بە کەسانی تر دەدا رەمز و رازی تێکرای ئەوەشتەی بە دەروونماندا تێدەپەڕێ ئاگادار بن. ئەوانەی کە ناتوانن نهێنی ئەوە بدۆزنەوە، مۆڵەتی بیستنی ئەو شتانەی پەیان پێدەبەین و ئەو جموجوڵە زەینییەی ئێمە، دەستەبەر ناکەن. ت٢٧).

**دەبینە هۆی ئەوەی کە بزوێنەرە هاوبەشەکان چالاك بن. ڕێگەی دەربڕین دەدەین بە گەورەترین و وردترین شت، بە سەرسوڕهێنەرترن پرسی نەبیسراو تەنانەت مەحاڵیش کە بە بیردانایات. تێکڕای ئەمانە بەهۆی سادەیی خودی زمانەوە دەردەکەون.**

کەواتە تایبەتمەندی زمان بە بۆچوونی شلگل، ئازادبوونیەتی لە ژێر کۆنترۆڵی دەرەکی وەیا **ئامانجی کرداری**[1]، چونکە هەر ئەو لە شوێنێکی تردا دەڵێ: (*هەموو ئەوشتانەی لە ڕێگەی توخمی دەروونی مرۆڤەوە دەردەکەون، بە ڕاستی پێیان دەوترێ زمان*).

ویناکردنێکی ئاوا بۆ زمان، نزیکە لە هاوئاراستە بوونی لایەنی داهێنەرانەی زمان لەپاڵ داهێنانی هونەریدا[2]. **شلگل** بە بووچوونەکانی وەك **هێردر** و **ڕۆسۆ**، ئاوا پێناسەی زمان دەکات: ( *زمان سەسوڕهێنەرترین توانای داهێنانی ئەدەبی یا شاعیرانەی مرۆڤە*. زمان و هۆنراوە ل١٤٥). زمان (*هۆنراوەیەکە لە بارەی هەموو نەوەکانی مرۆڤ، کە بەردەوام لە حاڵەتی بوون و گۆڕان دایە و هەرگیز کۆتایی نایات*. **زانستی هونەر** ل٢٢٦) بە هۆی ئەم چۆنییەتی هۆنراوەئاساییەی، کە تایبەتمەندی کردەی ئاسایی زمانە، دەتوانین بڵێین: (*هیچ کاتێك زمان لە دۆخی شاعیرانەی خۆی دەرناچێ و، دەتوانین هەمیشە کۆمەڵێك توخم و کەرەستەی بەربڵاوی هۆنراوەی تێدا بدۆزینەوە، تەنانەت ئەگەر، ئەم توخمانە، وشك و بێ*

---

[1] - Practical end

[2] - (...کە ئامرازی گواستنەوەی هونەرن، ئەو کردەوانەی مرۆڤ لە ڕێگەی ئەوانەوە، بۆچوونە دەروونییەکانی خۆی پێدەردەبڕێ. زانستی هونەر ل٢٣٠) (ئەم ئامرازانە بریتین لە زاراوەکان، ئاوازی ئاخاوتن، بزاوتی ئەندامەکان) کەواتە ئاساییە **شلگل** بەو ئاکامە بگات، کە زمان خۆی لە خویدا جۆرە شێوەیەکی نەمری هونەرە و، وێڕای ئەمە (هەر لەسەرەتای پەیدابوونیەوە، بە کەرەستەی سەرەتایی هۆنراوە دادەنرێ. زانستی هەنەر ل ٢٣٢).

*گیان، ئارەزوو و گرێبەستیش بن. لە واقعی ژیانی ڕۆژانەدا زمان خێرا، بێ نێوبەند، بەکەڵك، لە ژینگەکانی چالاکی مرۆیی دا لە ئارادایە.* هەمان سەرچاوە ل٢٢٨) دواتر **شلگل** دەڵێ: بەم پێیە گرفت نییە کە **بە جۆردین مۆلێر** بڵێین وتەکانت هەم پەخشانە و هەم هۆنراوە.

چۆنییەتی **هۆنراوەئاسای** زمانی ڕۆژانە، لە سەربەخۆیی و پاڵنەری بێ دابڕانەوە دێ، واتە (*جیهانیکە بە هەستە جەستەییەکانی ئێمە پەی پێدەبرێ*) هەروەها ئازادبوونە لە مەبەستە کردەییەکان. ئەم تایبەتمەندییانە لەگەڵ بێ سنووری زمان وەك ئامرازێك بۆ گوزارشت لەخۆکردن، لە ڕاستیدا هەر ئەو تایبەتمەندییانەن کە کە **دیکارت** و پەیڕەوانی دیکارت، ئەژماریان کردوون. ئیستا جێگای سەرنجە، کە لێکدانەوەی **شلگل** لەمەڕ پەیوەندی داهێنانی ڕاستەقینە، لەگەڵ ئەوەی ئێمە ناومان ناوە لایەنی داهێنەرانەی زمان، کەمێك درێژتر باسی بکەین. هونەریش وەك زمان توانایەکی بێ سنووری دەربڕینی هەیە[١]. وەلێ شلگل دەڵێ هۆنراوە

---

[١]- لە ڕوانگەی شلگلەوە (زانستی هونەر ل٢٢٥) هونەر هزرێکی بێ کۆتاییە، هەر لەبەر ئەوە ڕێرەوی هەوڵەکانی پێشبینی ناکرێ، وەلێ ئەوەی بە درێژایی کات لە هەوڵەکانی ئەم بوارە وەدی دێ و دەکرێ وەدی بێ، دیاری ناکرێ و لێکدانەوەیەکی بۆ وێنا ناکرێ، لەبەر ئەوە ناتوانین سنوورێك بۆ هوونەر دیاری بکەین، دەقی وتەکەی **شلگل** ئاوایە:

Bei Der Poeise findet e saber in noch hoherem Grade statt; denn die ubrigen doch nach ihern beschrankten Medien oder Mitteln der Darstellung eine bestimmte sphar, die sich einigermassen ausmessen lasst. Das Medium der poesie die sich einigermassen ausmessen lasst. Das Medium der poeise aber ist eben dasseble, wodurch der menschliche Geist uberhaupt zur besinung gelangt, und seine vorstellungen zu willkurlicher verknupfung und Ausserung in de gewalt bekommt; die sprache. Daher ist sie die auch nicht an gegen stand gebunden, sondern sie schafft sich die ihergen selbst; sie ist die umfassendste aller Kunste, und gleichsam der in ihnen uberall gehenwartige Unversalgeist. Dasjenige in de Darstellungen der ubrigen kunste, wasunsuberde gewohn liche wirklichkeit in eine welt der phantasie

بارودۆخێکی تایبەت بەخۆی هەیە. هۆنراوە بە واتایەك، بنەمای هونەرەکانی ترە و، خۆی خاوەنی شێوەی بنەڕەتی و هونەری تایبەتییە. وەلێ کاتێك لەم تایبەتمەندییە دەگەین، کە زاراوەی شاعیرانە بۆ نیشاندانی چۆنییەتی واقعی داهێنەرانە، لە هونەرەکانی تر دا بەکاردەهێنین. هۆی بەناوندبوونی هۆنراوە لە ناو هونەرەکانی تردا، کەڵك وەرگرتنە لە زمان. هۆنراوە بابەتێکی تایبەتە، چونکە ئامرازەکانی ئازاد و بێ سنوورن. ئامرازەکانی هۆنراوە: مانای زمان، سیستمێکی خاوەن توانای شاراوە بۆ داهێنان لە ڕێکخستن و دەربڕینی بیرو باوڕەکان. هەر بەرهەمێکی هونەری، دوای چالاکییەکی داهێنەرانەی زەینی هەوێن دەکرێ، کە ئامرازەکەشی لە زمان پێکهاتووە. کەواتە هۆنراوە هەمان کەڵك وەرگرتنی داهێنەرانەیە لە زمان، لە لایەکی تر، بێ لەبەرچاوگرتنی ئەو بوارەی هەوێنی دەکا، دەبێتە بنەمای هەر خەیاڵێکی داهێنەرانە. بەم پێیە هۆنراوە لە ناو هونەرەکاندا دۆخێکی تایبەت وەخۆ دەگرێ و هەر جۆرە داهێنانێکی هونەری،

---

erhebet, nennt man das poetische in ihen; poesie bezeichnet also in diesem sinne uberhaupt die kunstlerische Erfindung, den wunderbaren Akt, wodurch dieselbe die nature bereichert; wie der Name aussagt, eine wahre Schopfung und Hervorbringung. Jeder ausseren materiellen Darstellung geht eine innere in dem Geiste des Kunstlers voran, bei welcher die sprache immer als vermittlerin des bewusstseins eintritt, und floglich kann man sagen, dass jene jederzeit aus dem schosse der poesie her vorgeht. Die sprache ist ein product der nature, sondern ein Abdruck des menschlichen Geister der darin die entstehung und verwandtschaft seiner Vorsteellungen und den ganzen Mechanismus seiner Operationen niederlegt. Es wird also in derpoeise scon Gebildetes wieder gebildet; und die Bildsamkeit ihers organs ist ebenso grenzenlos als die Fahigkrit des Geistes zur Rukkehr auf sich selbst durch immer hohere potenziertere Reflexionen. 

پەیوەندی بە لایەنی داهێنەرانەی زمانەوە هەیە[1]. ئەم خاڵە لەگەڵ سێهەمین خاڵی هێزی ئاقڵمەندیە لە بیروباوەڕەکانی **هوارتە** دا).

**شلگل،** زمانی مرۆڤ و ئاژەڵ بە هەمان ڕێبازی دیکارتی لێکجیا دەکاتەوە. ئەو پێیوایە کە ناکرێ توانایی زمانی مرۆڤ، بە تەنیا بۆ حاڵەتی ئەندامەکانی بگێڕینەوە:

**جۆرەها ئاژەڵ بە رادەیەکی دیاری کراو لایەنی هاوبەشیان لەگەڵ مرۆڤدا هەیە، دەتوانن لانیکەم بە شێوەی میکانیکی فێری ئاخاوتن بن. لە راستیدا ئاژەڵ لە ڕێگەی پێویستی و دووبارە بوونەوەی رۆژانە، بزوێنەرێك بۆ جموجوڵێکی دیاری کراوی ئەندامەکانی دەخاتە گەڕ، وەلێ ئەمانە هەرگیز وشەی فێرکراو بە شێوەی سەربەخۆ بەکار ناهێنن، تا ئاماژەی پێ بەشتێك بکەن (رەنگە بە رواڵەت وا دەرکەوێ). لە ئاکامدا زمانی ئەوانە زمانی خۆیی و واقعی نییە بۆ ئاخاوتن، بەڵکۆ جۆرێکە لە دەرهێنانی دەنگ کە لە دەزگای دەنگەوە دێتە دەرەوە.** (ل٢٣٦)

ناتوانین کارایی زەینی مرۆڤ و ئاژەڵ پێکەوە بەراورد بکەین. ئاژەڵەکان بە واتا مرۆییەکەی، لە جیهانی پێداویستییەکانیاندا دەژین، نەك لە جیهانی بابەتەکاندا. (*دەتوانین تا رادەیەك هەمان لێکدانەوە بۆ منداڵان بکەین*)، چونکە لەسەر ئەم

---

[1]- بۆ بەدواداچوونی پتر لە مەڕ چییەتی و سەرچاوە و کەشەکردنی **تیوری جوانناسی رۆمانتیك**، بڕوانە:

M. H. Abrams, The merror & The Lamp, Oxord University Press (1953).

باسێك لە بارەی فەلسەفە و زماندا لە روانگەی رمانتیکییەوە، لە بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەد گونجێنراوە:

E. Cassirer, The philosophy of Symbolic Forms (1923, English Tranlation, Yale University Press. 1933)

هەروها بڕوانە:

E. Fiesel, Die Sparchphilosophie der deutschen Romantik. Tubingen Verlag. Von. J. C. B. Moher (1927)

بنەمایە دەتوانین، شێواوی و پچڕپچڕی تەنانەت زیندووترین یادگارەکانی منـدالّی روون بکەینەوە). بە رای **شلگل بەسترانەوی ئاژەڵی**[1] بە تەواوی لەگەڵ **خۆپەسندیی مرۆیی**، واتە بنەمای **ئیرادەی ئەقلانی** کە روونکەرەوەی ژیانی مرۆییـە، دژپـێکن. ئەم بنەمایەیە دەبێتە بناغەی زمانی مرۆڤ و، دەگا بە هاوئاهـەنگی و یەکییـەتی لە تاقیکردنەوەکاندا و کاریگەروەرگری ئاگایانە (*کە پێویستی بە چـەند نیشـانەی زەینی هەیە*) و نیازەکان و توانا تایبەتییەکانی مرۆڤ. (*لـەپاڵ ئـەوەدا ئێمـە ئـەوە شتە بە زمان باس دەکەین، کە ناتوانین لە ئۆرگانـە هەسـتییەکاندا دەری بـبڕین*). سەرئەنجام زمانی ئێمە زمانێکە کە ئامانجـە بنەڕەتییەکـەی (**جولاّنـدنی** *ئەنـدامی هزرە، واتە ئەو راگەیاندنەی خۆی دەگاتە زەین) و ئامانجی* **پەیوەندی کۆمەڵایەتی**[2] *زمان تەنیا ئامانجی لاوەکییە.* ل**٢٣٧** تا **٢٤١**).

جەخت کردنەوەی **دیکارت**، لەسەر رۆڵی داهێنەرانەی کەڵك وەرگرتن لە زمان، لـە پلەی تایبەتی سەرەکی و جیاکەرەوەی زمانی مرۆڤ، لە هەوڵەکانی **هامبۆڵت** دا بۆ تۆمار کردنی تیۆرییەکی گشتی و تۆکمە لەمـەڕ زمـان، بـە باشـی نیشـاندراوە[3].

---

[1] - animal dependency

[2] -social communication

[3]- بە شێوەیەکی دیاری کراو لەم کتێبەی خوارەوەدا، کە لەساڵی ١٨٣٦ دوای مردنی بڵاوکراوەتەوە:
Uber die Verschiedenheit des Menschlichen Spraschbaues
چاپێکی تری لە ساڵی ١٩٦٠ بڵاوکرایەوە: (F. Dummmlers Verlag, Bonn) ژمارەکەی لاپەڕەکانی کۆتاییە. چەند بەشێك لەم کتێبە لە کتێبـی **کـوان** دا ( Humanist, without portfolio, Ditroit, Wayne State University Press, 1963) وەرگێڕدراوە بۆ ئینگلیزی. شرۆڤەو وەرگێرانـی تـەواوی ئەم کتێبە لە لایەن **ویرتل** ئەنجام دراوە. بوارەکانی تیۆرییەکانی **هامبۆڵت** لە نامەی دکتۆرای چاپ نـەکراوی. ل. **براون** ( Some Sources and Aspects of Wilbelm von Humboltdts Conception of Linguistic Reletivity) لە زانکۆی **ئیلینویز** (١٩٦٤) تاوتوێ کراوە.

هامبۆڵـت لـە تیورییەکـەی خـۆی دا زمـانی بـە جۆرێـك **چـالاکی** دانـاوە، نـەك (**دەسکەوتێکی بەرهـەمهاتوو**)[1]، هـەروەها بـە جۆرێـك **وەدیهـێن** دەزانـێ، نـەك **بەرهەمی بێ گیان**[2]، وە بە هەمان رێبازی ئاسایی زمانناسـی دیکـارتی و **تیـۆری جوانیناسی**[3] و فەلسەفەی رۆمانتیك، زمان شرۆڤە دەکات. بە رای هامبۆڵت تەنیا پێناسەی راستی زمان ئەمەیـە کـە بڵـێین **چـالاکیەکی بەرهەمهێنـە**[4]، واتـە (*لـە راستیدا کارێکی بەردەوام و دووبـارە کـراوەی روحـی*)یـە[5]. فاکتـەرێکی نـەگۆڕ و

---

**بلۆمفیلد** نامەکەی **هامبۆڵت** بە (یەکەمین گەروە کتێب لە بارەی زمانناسی گشتی دا. زمان ل١٨) دادەنێ.بە سەرنجدانە ئەو ئەو بوارەی کە ئێمە لێرەدا خستومانەتە ژێر باس و لێکۆڵینەوە، وێدەچـێ ئـەم نامەیـە خـاڵی کۆتایی زمانناسی دیکارتی بێ، نەك دەسپێکی قۆناغێکی نـوێی بیرکردنـەوەی زمانناسـی. بـۆ لێکۆڵینـەوە لەمـەڕ **زمانناسـی گشـتی هاوبـەش ی هامبۆڵـت** و، پەیوەنـدی لەگـەڵ بەرهەمـەکانی سـەدەی دواتـر و، دەرکەوتنەوەی دووبارەی ئەو بابەتە لە توێژینەوەکانی هاوچەرخ دا، لەمەڕ زمان و مەعریفە، بڕوانە:
Chomsky, Ccurrent Issues in Linguistic Theory.

1- باوەڕناکەم ئەم چەمکانەی **هامبۆڵت** بە تەواوی روون بن، من لێرەدا تەنیا لە لایەنێکی دەکۆڵمەوە. لەبـەر ئەوەی، دەقەکە تەنیا یەك لێکدانەوەی تاك لایەنەی ئەم چەمکانە بە شێوەیەکی روون دیاری دەکات، زۆر روون نییە. لەگەڵ ئەوەشدا باشترە بەو ئاکامە بگەین کە ئەوەی لێرەدا دەخرێتە روو، لانیکەم یەکێکە لـە بۆچـوونە سەرەکییەکانی بیرکردنەوەی **هامبۆڵت**. من بۆ زۆربەی راو بۆچوون و پێشنیارەکانی لێکدانەوەی دەقەکـە خـۆم بە قەرزاری **ج. ویرتل** دەزانم.

2 -lifeless product

3 -aesthetic theory

4 -productive activity

5- بە بۆچوونی هامبۆڵت، بە **بەرهەمهاتوو** زانینی زاراوەیەکی زمان، مانـای گێڕانـەوەی ئـەو زاراوەیـە بـۆ سیستمی توخمەکانی ژێرساز، کە لێوەی بەرهەمهاتووە، ئەو توخمانەی کـە دەکـرێ بـە کـەڵك لێوەرگرتنیـان، ژمارەیەکی زۆر زاراوەی تر، هەر لەسەر ئەو ریسایانە دروست بکرێ. لەم لێکدانـەوەدا کـە زاراوە **بەشـتێکی بەرهەمهاتوو** لەبەرچاو دەگیردرێ و بە هۆی زمانەوە پەی پێدەبرێ، نەك بەهۆی پرۆسەی بـەراوردکردن لەگـەڵ **تواناو هەستە ئاژەڵییەکان**. لە لاپەڕە ٧١ ئەم دەقە دەخوێنینەوە:

تەنیا، ژێرخانی ئەم **چالاکیە روحیەیە**[١] هەر ئەم فاکتەرەیە کە هامبۆڵت ناوی دەنێ **شێوەی زمان**[٢]. تەنیا یاسا نەگۆڕەکانی زمان، **یاساکانی بەرهەمهێنن**[٣]. پانتایی و ئەو شێوەی کە پرۆسەکانی بەرهەمهێن بۆ بەرهەمهێنانی وتە (*یا پەی بردن بە وتە*

---

ئێستاکە ئەوەی لە بنەڕەتدا بە **بەرهەمی** زمانی ئەژمار دەکرێ... ئەمەیە: کە زاروە بە شێوەی راستەوخۆ وەك بەشێك لە گشتی بێ کۆتایی، واتە زمان، دەردەکەوێ. لەبەر ئەوەی لەم رێگایەوە بۆ تاك تاکی زاراوەکان ئەم زەمینەیە دەخولقێ، بۆ ئەوەی لە توخمەکانی ئەم بەرهەمە، کۆمەڵێکی نادیار زاراوەی تر لە سەر بنەمای هەست و رێسا دروست بکرێ و، لەنیوانیاندا جۆرێك پەیوەندی، هاوەرێکی پەیوەندی گشتی نێوان چەمکەکان، سەرهەڵبدا.

ئەو دواتر ئەم مانایە پتر روون دەکاتەوە و ئاماژە بەوە دەکات، زمان تەنیا پرۆسەی بەرهەمهێنە، کە لە زەین دا پەسند دەکرێ و ناتوانین بە شێوەیەکی تر دەریبخەین. ناکرێ زمان بە گشتێکی دیاریکراو بچوێنین، بەڵکو زمان دیاردەیەکی بەرهەمهێنە، کە رێساکانی بەرهەمهێنانی تێدا حەشار دراوە، هەرچەند سنووری ئەم بەرهەمهێنییەش بە تەواوی نادیار ماوەتەوە.

ئەم وتانە لەگەڵ پێناسەی **بەرهەم** لە روانگەی شلگل دا بەراورد بکە (زانستی هونەر ل**٢٣٩**)

بەرهەمهێنانی گوتار (هەروەها پچڕانی ئاخاوتن)، لە جوڵەی دەسکرد و کاریگەری ئەندامەکانی ئاخاوتن دا شاردراوەتەوە. کەواتە لەگەڵ کردەوەکانی هاوشێوەی زەین هەمنەوایە. ناوبراو دەڵی، زمانی بەرهەمهاتوو، جیاوازە لەو دەنگە هەستییانەی ئاژەڵەکان و ناکرێ لەسەر لاسایی کردنەوەی کوێرانە دروست بکری، بەڵکو پێویستی بە چەند بنەمای نوێ هەیە. (بڕوانە یاداشتی ژمارە ٣٠)

[1] - mental labour

[٢] - language form بڕوانە لاپەڕەی ٥٨:

Das in dieser Arbeit des Geistes, den artiulirten Laut zun Gedankenauedruck zu erheben, liegende Bestandige und Gleichformige, so volstandig , als moglich, in seinem Zusammenhange aufgefasst, und systematisch dargestellt, macht die Form der Sprache aus.

وادێتە بەرچاو، (شێوەی زمان لە روانگەی هامبۆڵت) ەوە هەر لە سەر ئەو شتە بێت، کە ئەمڕۆ لە فراوانترین واتای خوی دا ناوی دەنێین (دەستووری بەرهەمهێن). بڕوانە لاپەڕەکانی ٤٣ت ٤٥ی ئەم کتێبە.

[٣] - مەبەست ئەو یاسایانەن کە وشە، زاراوە و رستە بەرهەمدێنن کە پێیان دەوترێ ( Generative linguistic rules)

*که هامبۆڵت لەگەڵ کردەی زمانی تا رادەیەك بەیەکسانیان دەزانێ*) بەکاری دێنێ بە تەواوی نادیارن).

چەمکی شکڵ، **رێساکانی وتە رێکخستن**[1] و رێساکانی **زاراوەسازی** و هەروەها یاساکانی شێوەدان بەو چەمکانە دەگرێتەوە، کە چینی **زمانە بنەماییەکان** دیاری دەکات.(ل ٦١). بە پێچەوانەوە، ماکی زمان، **کەرەستە** و ئاوا یا دەنگی بەرهەم نەهاتووە (ل٦١). شێوەی زمان پێکهاتەیەکی رێکخراوی هەیە، تاك توخمەکانی وەك بەشی لیکجیا نین، بەڵکو تا ئەو شوێنەی **میتۆدەکانی پەروەردەی زمان**[2] رێگە بدەن، لەگەڵ یەکتر ئاوێتەیان دەکات. (ل٦٢).

ئەو میکانیزمە نەگۆڕانەی لە رەنگدانەوەی رێکخراو و هاوئاهەنگی خۆیاندا، شێوەی زمان دروست دەکەن، پێویستە وا لە زمان بکەن بتوانێ تا پانتاییەکی بێ سنووری کردەی گوفتاری بەرهەم بێنێ، کە هاووێنە بێ لەگەڵ ئەو هەل و مەرجانەی بە هۆی پرۆسەی بیرکردنەوە هاتوونەتە ئاراوە. پانتایی زمان بێ سنوور و بێ لێوارە، (*هەرشتێك دەگرێتەوە کە وێنا بکرێ، ل.١٢٢*)[3]. لە ئاکامدا، دەبێ تایبەتمەندی بنەڕەتی زمان، بۆ کەڵك وەرگرتن لە چەندین میکانیزمی دیار و دیاری کراو، لە بارودۆخی پیشبینی نەکراو دا، توانای بێ سنووری هەبێ. (*پێویستە زمان بە ئامرازی دیاری کراو، کارایی بێ سنوور بدا بەدەستەوە و، بتوانێ لە رێگەی تاکە پێناسە هێزی بیرکردنەوە و زمان، ئەم کارە ئەنجام بدات. ل١٢٢*).

---

1 -rules of speech articulation”

2 – method of language formation

٣- واتا بە بیر دابێت. و/کوردی.

لەسـەر بنـەمای رایـەکانی **هامبۆڵـت**، تەنانـەت نـاتوانین زاراوەکـانی زمـان بـە کەرەستەیەکی خۆشکراو، زیندو و ئامادە لەقەڵەم بدەین. جگەلـە رۆنـانی زاراوەی نویٚ، تەنانەت کەڵك وەرگرتن لە زاراوە بە هۆی بێژەر یـا بیسـەرەوە، لـە راسـتیدا (*بەرهەمهێنانی پوختـە و کامـڵ، هـەروەها بەرهەمهێنانـەوەی هـەمان توانـایی پێکهێنان و دروستکردنی زاراوەکانە. ل١٢٥-١٢٦* ). ئەم وتەیە، هـەم لـە بـارەی شکلگرتنی زمانی سەرەتایی منداڵان، هەمە لە بارەی مەودای ئەنجامدانی کـاری رۆژانەدا، راستە ). بەم پێیە ئەو زاراوەکـان بـە پێرسـتێك نـازانیٚ، کـە بـە یادگـە سپێردرابن و لە کاتی کـەڵك وەرگـرتن لـە زمـان، زاراوەی لیٚ دەربێنـیٚ. (*ئەگـەر دەروونی مرۆڤ بە شێوەی غەریزی، خودی کلیلی رۆنـان و پێکهێنـانی زاراوەکـانی نەبێت، ئەوا یادگەی هیچ مرۆڤێك بەشی ئـەو پێرسـتە ناکـات*). **هامبۆڵـت** پێـی وایە، زاراوەکان لەسەر بنەمای یاساکانی بەرهەمهێنی تایبەت هەڵدەبژێدرین، کـە جۆری تایبەتی ئەو زاراوانە لە بـارودۆخی دیـاری کـراودا دیـاری دەکـا و ریٚکیـان دەخات. لە سەر ئەم گریمانە بوو کە ناوبراو بۆچوونە بـە ناوبانگەکـەی دامەزرانـد: چەمکەکان لەسەر بنەمای **ناوەندەکانی مانا**[١] رێکدەخرێن و **بەهای** خۆیان لە سـەر ئەو پەیوەندییە دیاری دەکەن، کە ئەم سیستمە ماناییە پێیان دەبەخشیٚ.

وتە ئامرازی بیرکردنەوە و **خۆکردە**[٢] و رۆڵێکی **هەمیشەیی** و **بنیاتنەر** دەگێڕی، لە دیاری کردنی چۆنییەتی پرۆسەی مەعریفەی زمـان، هـەروەها **هێـزی داهێنـەری**[٣] **بیرکردنەوە** و **جیهانبین** ی ئەو، هەمان رۆڵ دەگێـڕیٚ لـە **پەیوەنـدی هـزری** ئـەودا.

---

[1] -semantic fields

[2] -self-expression

[3] -world view & creative power

(ل٥٠). به گشتی، زمانی ئادەمیزاد گشتێکی رێکخراوە، شوێنەکەی دەکەوێتە نێوان مرۆڤ و(*سروشتی دەروونی دەرەکی کاریگەر لەسەر ئەو، واتە مرۆڤ*). هەرچەندە زمانەکان تایبەتمەندی هاوبەشیان هەیە، کە دەتوانین بە زادەی زەینی مرۆڤی بزانین، وەلێ هەر زمانێك**جیهانبینی**[1] و روانگەی تایبەت بە تاکی خۆی دێنێتە ئاراوە. **هامبۆڵت** بە گێڕانەوەی ئەم رۆڵە بۆ زمانە جیاوازەکان، لە تێڕوانینی **دیکارت** دوور دەکەوێتەوە و، روانگەیەك هەڵدەبژێرێ کە لە بنەڕەتدا رۆمانتیکییە.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، کاتێك هامبۆڵت دەڵێ: (*مرۆڤ خاوەنی دنیای دەنگ و دنیای بابەتەکانە، کە تێگەیشتن لە چەمکەکان، دەرئەنجامی هاوکاری و پێکەوە گونجانی جیهانی دەنگ و جیهانی بابەتەکانە. ل٧٠*) و مادام لە بنەڕەتدا زمان بە ئامرازی بیرکردنەوە و خۆدەربڕین دەژمێرێ، نەك سیستمێکی پڕاکتیکی بۆ پەیوەندی، وەك زمانی ئاژەڵ، لە چوارچێوەی بیرکردنەوەی دیکارتی دا دەمێنێتەوە. لەسەر ئەم بنەمایە زمان تەنانەت لە سەرتای بوونی دا (*بە شێوەیەکی بێ سنوور و خۆی بۆ خۆی، تێکڕای بابەتەکانی تێگەیشتنی رێکەوت و هەستپێکراو و دەروونی، دەگرێتەوە. ل٧٥*). بەم پێیە، **هامبۆڵت** ئەم بڕوایە کە زمان زادەی نیازی مرۆڤە بۆ هاوکاری کردن، بەهەڵە دەزانێ (*مرۆڤ ئەوەندەش پێویستی بەزمان نییە، چونکە دەنگی ئەداکراو دەتوانی بۆ یارمەتی بەرامبەر بەس بێی. ل٧٥*). بە دڵنیاییەوە زمان خاوەنی کارایی پڕاکتیکییە، وەك ئەو کاتەی کەسێك فەرمان دەدا درەختێك ببڕدرێتەوە و (*لەو درەختە بەولاوە بیر لە هیچ شتێکی تر ناکاتەوە، چونکە زاراوەکە دەلالەت لە درەختەکە دەکات.*

[1] - thought world

ل٢٢٠ ). بەڵام هەر ئەم زاراوانە ئەگەر لـە هۆنراوەیەکـدا بـۆ باسـکردنی سروشـت بەکار ببرێن، رەنگە بایەخی چەند ئەوەنـدەیان هـەبێ، چـونکە بـۆ ئـامراز یـا بـۆ کاردانەوەیەك بە کار ناهێنرێن. زاراوەکان تەنیا *(لەگەڵ یـەك چـالاکی دەروونـی و شێوەی تاکلایەنە و بۆ خزمەتی ئامـانجێکی دیـاری کـراو کـەڵکیان لێوەرنـاگیرێ، بەڵکودەگەرێنرێنـەوە بـۆ شـێوەی سـەرەتایی (ل٢٢١ )*. تـەنیا لـەم بارودۆخـەی دواییدایە کە تێکرای تواناکانی زمان، لە شکلگیری یا لێکدانەوەی گوتـەدا بـەکار دەبرێن و، هەموو لایەنەکانی زاراوەکان و پێکهاتە دەسـتووری یـەك گوتـەزا، لـە لێکدانەیەوەیدا دەور دەگێڕن. کەڵك وەرگرتنی پڕاکتیکی لە زمان، تایبەت بە هیچ زمانێکی مرۆیی واقعی نییە، بەڵکو ئەوە تایبەتمەندی ئەو دەزگایانەن کە زیـادە و ساختەن[١] .

**هامبۆڵت** بە خستنە رووی چەمکی **شێوەی زمان**[٢] لە پلەی سەرەکی **بەرهەمهێن** و نەگۆڕ و گۆڕانهەڵنەگر، لە زەمینەی دیاری کردنی پانتایی، هەروەها دیاری کردنـی ئەو ئامرازەی بـۆ کـردەی **داهێنەرانـە** و بـێ سـنووری کـەڵك ورگـرتن لـە زمـان پێویستە، هاوکارییەکی مەزن و بێ وێنە بە تیۆری زمانی دەکات، یارمەتییەك کە بە داخەوە تا ئەم قۆناغانەی[٣] دوایی نەناسراومایەوە و کەڵکی لێوەرنەگیرا. کاتێـك

---

[١]- بۆ نموونە دەتوانین زمانەکانی نێوان کەناراوەکانی دەریای سپی ناوەڕاست ناوبەرین، کە لـە رووی سیسـتمی پەیوەندی ئاژەڵانەوە یا گەمە زمانییەکان، لەو جۆرەی **بلۆمفیلد** و **ڤینگشتاین** و زۆری تریش باسیان دەکەن و لە ریزی **شێوەی زمانە سەرەتاییەکان** یان دادەنێن.

[2] -form of language

[٣]- لە روویی شوناسایی بارودۆخی تایبەتی یـەك زمـان، لـە ئاسـتی بابـەتی لێکدانـەوە لەگـەڵ **واقعییـەتی دەروونی**، ئیمە لە روانگە و بۆچوونەکانی **هامبۆڵت** دوور دەکەوینەوە، ئەویش لەبەر ئەوەی پێناسەیەکی روون، بۆ پەیوەندییەکانی **هاوکاتی** و **ناوکاتی** نادەن بە دەستەوە.

دەتوانین پەی بە چۆنییەتی دەسکەوتەکانی **هامبۆلْت** ببەین کە بەراوردیان بکەین لەگەڵ چەمکی **شێوە** لە کتێبێکی وەك کتێبی **هۆرمز** دا (١٧٥١) کە **هاریس** نووسیویەتی. بە بۆچوونی **هاریس** زمان بریتییە لە کۆمەلێك زاراوە کە ماناکانیان (*ئەو چەمکانەی وشەکان هێمایانن*)، شێوەی زمانی و دەنگەکانیان، ماکی زمان پێکدێنن. بۆچوونی **هاریس** لەمەڕ **شێوە** لەسەر نموونەی کلاسیکی دروست و رێك و پێك کراوە. ئەم نموونەیە لەسەر **شێوەی** دەرەوە و رێکخستن دامەزراوە. بەلاّم **هاریس** هەرگیز نالێ باسکردنی **شێوەی** زمان پێویستی بە شتێکی پترە، لە دیاری کردنی توخمەکانی و، پەیوەندی **نێوان توخمەکانی**[1] لەگەڵ توخمەکانی **دەربڕین** دا. بە واتایەکی تر، ئەو هیچ نیشانەیەك لەمەڕ تێگەیشتنی بۆچوونی هامبۆلْت نادات بەدەستەوە، لەسەر ئەوەی کە زمان لە زۆر **ئۆرگانی نموونەدار**[2] پێکهاتوو لە جۆرەها توخم بەولاوە ترە و، بۆ باسکردنی دەبێ پەیوەندییەکانی ئەم توخمانە، لەگەڵ دەزگای تایبەتی بنەما بەرهەمهێنەکان، دیاری بکرێ. ئەم **بنەمایانەی بەرهەمهێنی زمانی**[3]، یەك یەك توخمە زمانییەکان و پەیوەندیی نێوانیان، دیاری دەکەن و، دەبنە هۆی فرەجۆری بێ سنووری ئەو کۆمەلّە ردە زمانییەی، کە دەکرێ هەرکامێکیان بە شێوەیەکی مانادار ئەنجام بدرێ[4].

---

[1] -content elements

[2] -patterned organization

[3] -Linguitic creating principles

[4]- **هاریس** لە کتێبی **هۆرمز** دا لە زمان **ئامۆنیس**ەوە، کە **بزوتن** بە **سەما** و **تەختە** بەدەرگا و، هێزی بەرهەمهێنانی دەنگسازی ئاخاوتن (وەك بنەمای مادی گوتار)، بە (بە واتای خۆمانە بە کەلّك وەرگرتن لە **ناو** یا **کار** (فەرمان))، دەبەستێتەوە ( کە وەك شێوەکەی لە روحی تەنیای ئادەمیزادەوە سەرچاوە دەگرێ، هەروەك چۆن بنەمای مادی لە سروشتەوە دێ)، بە ئەگەری زۆر لە چەمکی شکلّی **هامبۆلْت** نزیك دەبێتەوە. بڕوانە پەراوێزی کۆمەلّە بەرهەمەکانی **هاریس** بەشی **یەك** لاپەڕە ٣٩٢.

له کاتی خستنه رووی بۆچوونی **هامبۆلت**، لەمەڕ **شێوەی زمان**، ناکرێ زەمینەی پێشووی باسه فراوان و قووڵەکانی سەردەمی رۆمانتیکی لەبەرچاو نەگرین، لەمەڕ جیاوانی نێوان **شێوەی میکانیکی** و **شێوەی ئۆرگانیکی** زمان. أ. و. شلگل بەم شێوەیە باسی ئەم جیاوازییە دەکات:

**شێوە، کاتێك بە هۆی هێزی دەرەکییەوە و بە تایبەتی بەهۆی زیادبوونی بە رێکەوت و بێ گەڕاندنەوە بۆ چۆنیەتییەکەی، دەبێتە بەش لە شتێك، ئەوا پرسێکی میکانیکییە، وەك ئەوەی کاتێك شێوەیەکی تایبەت بە تەنێکی نەرم دەبەخشین و ئەو تەنە دوای رەق بوون، ئەو شێوەیە دەپارێزێ، شێوەی ئۆرگانیش زاتییە، و لە ناوەوە دەردەکەوێ و هاوکات لەگەڵ کامڵبوونی تەنەکە بە پلەی پێگەیشتنی خۆی دەگات.**

**کۆلریج** بەم شێوەیە باسی هەمان بابەت دەکات:

**کاتێك دەتوانین شێوە بە شتێکی میکانیکی لەقەڵەم بدەین کە شێوەیەکی پێشوەخت دیاری کراو بە تەنەکە بدەین. ئەم شێوەیە لە ریشەی تایبەتمەندییەکانی تەنەکەدا نییە، وەك ئەوەی کاتێك ئێمە شێوە بە تۆپەڵە قوڕێك دەبەخشین و دواتر قوڕەکە وشك دەبێتەوە ئەم شێوەیە**

---

**هاریس** لە شوێنی تردا دەربارەی بابەتێکی تر، واتایەکی تر بۆ **شکڵ** دەردەبڕێ کە لەوەی پێشوو کامڵترە. ناوبراو چەمکی **شێوە** لە ئاستی (بنەمای گیان بە بەرداکردن) دەخاتە روو: (شکلی گیان بەبەرداکەری شتێکی سروشتی، ئۆرگانەکەی نییە، رواڵەتەکەی یا هیچ کامیان لە شکڵەکان کەمتر نین، کە لایەنەکانی دەخولقێنن تا شیاوی دیتن بن، بەڵکو هێزێکە نەئۆرگانە و نەشکڵ و نەهیچ تایبەتمەندییەکی تر، وەلێ دەتوانێ دروستیان بکا، بیانپارێزێ و بەکاریان بێنێ. philosophical arrangement (1775, Works vol. II. P.59)

**دەپارێزێ. لەلایەکی تر، شێوەی ئۆرگانی زاتییە، چونکە لە ناوەوەدا بەرفراوان دەبێت و کامڵ بوونە دەروونییەکەی، هاوکات لەگەڵ شێوەی دەرەوی دا بە ئەنجام دەگات، مانای ئەوەیە شێوە وەك ژیان وایە، سروشت داهێنەرترین هونەرمەندە و گەلێك هێزی جۆراوجۆری لەبەردەست دایە. سروشت لە رووی شێوەپێدانیش خاوەنی داهێنانێکی بێ سنوورە - هەر رواڵەتێك نیشاندەری بوونێکی دەروونییە - ئەو رواڵەتە وێنەیەکی راستەقینەیە کە لە ئاوێنەیەکی قۆقزەوە دەردێتە دەرەوە[١].**

ناوەرۆکی وتەی هەردووکیان ئەمەیە، کە چۆن یەك یەکی کاری داهێنەرانە بە یاسا و بڕیارەکان دیاری دەکرێن. چەمکی **شێوەی ئۆرگانیك**ی زمان بە رای هامبۆڵت بەرهەمی ئاسایی تاوتوێ کردنی شکڵی میکانیکی و ئۆرگانییە، بە تایبەتی بە لەبەرچاو گرتنی ئەو پەیوەندییەی، لە نێوان داهێنانی هونەری و لایەنی داهێنەرانەی کەڵك وەرگرتن لە زمان دا هەیە[٢].

---

1 -Lectures and Notes of 1818" in T. Ashe (ed), Lectures and notes on Shakespeare and other English Poets, George Bell & Sons (1893) p. 229. "

هەندێك لە بۆچوونەکانی **کۆلریج** لە بارەی چییەتی زماندا، لەرووی جەخت کردنەوە لەسەر هێزی شاراوەی داهێنەر لە سنووری یاساگەلی دیاریکراودا، بەسەرکردنەوەی تێبینییەکانی **هامبۆڵت**ە لەسەر زمان. ئەو هەر لەو وتارەدا نکۆڵی لەوە دەکا کە بلیمەتی لەگەڵ **یاسا**دا ناکۆکە و دەڵێ: (هیچ کارێکی بەراستی بلیمەتانە، بە دوای شکڵی گونجاوی خۆیەوە نییە.)، **(بلیمەتی** ناتوانێ بێ **یاسا** بێ- چونکە هەر ئەمەیە کە دەبێتە هۆی بلیمەت بوون - هێزی کاری داهێنەر لە ژێر کۆنترۆڵی چەند یاسایەکە کە رەگ و ریشەی لە ناوخۆی دایە).

هەروەها لە شوێنێکی تردا دەڵێ: وەك ئامێری مۆزیکی هەواییە و، تەنانەت وەك ئۆرگیش نییە تابتوانین لە دەم رووباریك هەردەنگێك بمانەوێ دەربیبێنین، بەڵکو تا ئەو شوێنەی پەیوەندی بە شتومەکەوە هەبێ، لە کەمان یا سازێکی تر دەچێ بە چەند تارێکەوە، کە ژەنیاری لیهاتوو دەیژەنێ. وەرگیراوە لە:
R. Wellek Kant in England, Princeton University Press 1931, p 82.
بۆ زانیاری پتر بڕوانە: **ئابرامز** هەمان سەرچاوە.

[٢]- دەبێ ئاگادار بین، وێدەچێ ئەم باسەبە شێوەیەکی دیاریکراوە لە نامەکانی نێوان **هامبۆڵت** و **شلگل** دا هاتبێ. بڕوانە:

وێکچوونی **شکڵی ئۆرگانی** زمان، له بۆچـوونه‌کانی هامبۆڵـت دا و تیـۆری کـۆنی **گۆته** له‌مه‌ڕ **شێوه‌ی بونیادین**[١] له زینده‌وه‌رناسی[٢] دا زۆر جێگای سه‌رنجه‌. چه‌مکی

---

A. Leitzmann (ed), Briefwechsel, zwischen W. von Humboldt und A. W. Schlegel (1908) 

ئه‌م نووسراو گۆڕینه‌وانه‌، زۆر بابه‌تی میکانیکی و ئۆرگانیك ده‌گرێته‌وه‌، به‌ڵام له زه‌مینه‌یه‌کی تر دایه‌، مانای له باره‌ی په‌یوه‌ندی نێوان گه‌ردانگردن و چوونه پاڵ، وه‌ك پرۆسه‌یه‌کی زمانی. ئه‌مـه بابه‌تێکـه بـه ورده‌کـاری زۆره‌وه له‌م کتێبه‌ی هامبۆڵت دا نوسراوه‌:

Uber die Verschiedenheit des menschlichen Sprachbause. 

ئه‌م پرسیاره که شکڵی زمان چۆن له کرده‌ی تاکانه‌ی داهێنه‌رانه‌وه سه‌رچاوه ده‌گرێ، و دیاریشی ده‌کات، لـه‌م قۆناغـه‌دا پرسیارێکی نائاسایی نییه‌. بۆ نموونه کۆلڕیچ ده‌ڵێ: (زمان کرده‌یه‌کی سه‌یری مێژووییه له‌زه‌ینی تاك و ته‌نیادا، که له‌گه‌ڵ زه‌ینی هاوبه‌شی یه‌ك وڵات تێکه‌ڵ بووه‌... و شێواوی خـۆی گۆڕیـوه بـۆ هاوئاهـه‌نگی و گونجان.) وه‌رگیراو له‌:

A. D. Snyder, colridge on Logic and Learing, Yale Univ. Press (1929) p. 138. 

[1] -Urform" in biology

[٢]- بایه‌خ و شوێنی ئه‌م چه‌مکه له‌م دوو کتێبه‌ی خواره‌وه‌دا باسکراوه‌:

R. Berthelot, Science et philosophie chez Goethe, Paris. F.Alcan (1932); and R. Magnus, Goethe als Naturforscher, Leipzig, Barth (1905), translated by H. Norden, Henry Schuman Inc. New York (1949). 

هه‌روه‌ك هه‌مووان ده‌زانن، چه‌مکی **شکڵی ئۆرگانی** له زینده‌وه‌رناسی و فه‌لسه‌فه‌دا، هه‌روه‌ها لـه ره‌خنه‌شـدا، هه‌ر له‌م قۆناغـه‌دا په‌ره‌سنده که هه‌نووکه تاوتوێی ده‌که‌ین. بۆنموونه‌، چه‌مکی **شکڵی ئۆرگـانی** لـه رایـه‌کانی **شیلگل** دا، به‌راورد بکه‌ن له‌گه‌ڵ چه‌مکی شکڵی ده‌روونی (Bildungstrib) له روانگه‌ی **بلۆمان باخ**ه‌وه لـه زینده‌ورناسی دا، مانای واتای زیندو و به‌رهه‌مهێن و شکڵ پێده‌ر له ده‌روونی هه‌ر بوونه‌وه‌رێکدا، کـه شـکڵی **هه‌راشی** ئه‌و بونه‌وه‌ره ده‌نوێنێ و شکڵه‌که‌ی له **تۆره‌مه‌وه** تا هه‌راشبوون دیاری ده‌کا. **برتۆله** (ل٤٢٩) ده‌ڵێ که ئه‌م خاڵه بۆ رایه‌کانی هاوشێوه‌ی کانت، له ره‌خنه‌دا کـاری کردۆتـه سـه‌رهێزی بڕیـارده‌ر. نـاوبراو ده‌ڵـێ لـه فه‌لسه‌فه‌ی سروشتی **شلینگ** دا، وێنه‌یه‌کی ئاوا له‌مه‌ڕ کـاری سروشـت ده‌دا به‌ده‌سـته‌وه‌: (گـۆڕانی چـالاك و خاوه‌ن کوالێتی، له ژێر کاریگه‌ری خۆبه‌خۆیی و ده‌وونی له بنه‌ڕه‌تدا نائاگایانه‌، شێوه‌گه‌لی نـوێ به‌رهه‌مـدێنێ که به شێوه‌کانی پێشوو لێکهه‌ڵناوه‌شێن.) (ل٤٠) له‌سه‌رچاوه‌ی جۆراوجۆردا به‌دواداچوون بۆ ئـه‌م کاریگه‌رییـه کراوه‌، وه‌ك:

A. O. Lovejoy. The great chain of being; New York, Harper & Row (1936).

**شێوەی بونیادین** وەك ڕەهەندێکی بەولاوەترە لە چەمکی (ستاتیکی) شکڵ، بەو جۆرەی **لینە** و **کۆڤۆی**ە (واتە شکل بە مانای پێکهاتە و ڕێکخراو)، لەبەرچاو گیرابوو. بەڵام گۆتە لانیکەم لە قۆناغێکی بیرکردنەوەکانی دا، ئەم ڕەهەندەی بە خاوە نەزمی لۆجیکی دەزانی، نەك مادی. **گۆتە** لە نامەیەکدابۆ **هێردر** لە ساڵی ١٧٨٧ دا دەنووسێ:

**ڕووەکە سەرەتاییەکان، سەرسوڕهێنەرترین بوونەوەرە خوڵقێنراوەکانی جیهانن، لەم پرسەدا تەنانەت سروشتیش حەسوودیان پێدەبات. بە تاتوێ کردنی ئەم نموونەیە، دەتوانین کلیلی وەدەستهێنانی ژمارەیەکی بێ سنوور ڕووەك بدۆزینەوە. ئەمانە تەنانەت کاتێك کە بوونیشیان نییە، ئەگەری بوونیان هەیە، نەك لەبەر ئەوەی سێبەری نیگار یا جیهانی شاعیرانە یا تەنیا ڕواڵەت بن، بەڵکو لەبەر ئەوەی ڕاستییەکی دەروونی و زاتین. دەتوانین هەر ئەم یاسایە بۆ هەر بوونەوەرێکی زیندووی تر بەڕاست بزانین[1].**

کەواتە **شکڵی بونیادین** جۆرێکە لە **بنەمای بەرهەمهێن** کە چینی ئەو ئۆرگانیزمانە دیاری دەکا کە شایستەن. **گۆتە** لە شرۆڤە کردنی ئەم چەمکەدا، هەوڵی دا یاساکانی گونجان و یەکبوون بکاتە هاوکێشە، کە تاکە نیشانەی ئەم چینەن و، دەکرێ بە فاکتەری جێگیر و نەگۆڕی هەموو ئەو گۆڕانکارییانەی بزانین

---

بۆ زانیاری زیاتر و سەرچاوەی تر بڕوانە:

E. Mendelsohn "Biological Science in The Niniteenth Century; Some Problems and Sources' History of science.

[1]- لە زمان **ماگنۆسەوە** (هـ. س ل٥٩)، **لۆڤجۆی** ڕەگ و ڕیشەکەی بیرۆکە urbild ی **لۆجیکی** لە کتێبی **سروشت** دا (١٧٦١-١٧٦٨) لە نووسینی **ج. ب. ڕابینت**، دۆزیوەتەوە. ئەو لە زمان **ڕابینت**ەوە دەڵێ کە چەمکی **نموونەی سەرەکی** دەناسێ وەك ( ئەو سەرەکییە ئەقلانییەی ناگۆڕدرێ مەگەر بە شێوەی مادە هاتبێتە ئاراوە). **ڕابینت** دواتر ئەم چەمکە گشتگیر دەکات بۆ تێکڕای سروشتی گیاندار و تەنانەت بێ گیانیش.

که بەرهەمی گۆڕانی باروودۆخی دەوروبەرن. (*بۆ زانیاری پتر لەم بارەوە بڕوانە* ***ماگنۆس*** *بەشی ٧*). شکلی زمانی **هامبۆڵتیش**، بە شێوەیەکی ئاوا، تێکرای کردە تاکییەکانی بەرهەمهێن و خواستنی وتە لە زمانێکی دیار کراودا، کۆدەکاتەوە و لە چەمکێکی گشگیر تردا، لایەنەکانی هاوبەشی گشتی شێوەی دەستووری، چینی زمانەکان، دیاری دەکات[١].

---

[١]- نابێ ناونیشانی سەرەکی کتێبی **هامبۆڵت**، ببێتە هۆی ئەوەی گریمانەی ئەوە بکەین، کە ناوبراو لەگەڵ ئەم بڕوایە دابوو، کە هەر زمانێك تایبەت بە تاکێکە و دەشێ هەر پێکهاتەیەکی هەبێت. زۆر لە زمانناسانی دوای **هامبۆڵت**، بە شێوازی جۆراوجۆر ئەم بۆچوونەیان دەربڕیوە. تەنیا نموونەیەك لە رەخنەی **و. د. ڤیتینی** لە زمانناسی هامبۆڵتی ناو دەبەین:

"Steinthal and Psychological Theory of the Language" North American Review, 1872, reprinted in oriental and Linguistic Studies, New York Scribner, Armstrong & Co. 1874..

ئەو لەو بەرهەمەدا بەو ئاکامە دەگات کە (فرەجۆری بێ سنووری گوتەزای مرۆڤ، بە تەنیا بۆ رەتکردنەوەی ئەم بانگەشەیە بەسە، **یەکێکیان**، پەی بردنە بە توانای روحی پێویست، بۆ لێکدانەوەی وتە.( Oriental and Linguistic Studies. p360) **ئەوی تریان**، زمان دەسکەوتێکی مێژووییە، مانای شتێکە وەك (ئەو کۆمەڵە زاراوە و گوزارانەی مرۆڤ بە هۆی بیرکردنەوەی خۆی دەریان دەبڕێ) (ل٣٧٢). **م. جۆس** لە تاوتوێ کردنی ئەو شتەی ئەو ناوی دەنێ نەریتی **بۆئاسی** لە زمانناسی ئەمەریکایی دا، ئەم روانگەیە هەڵدەبژێرێ: زمانەکان بێ سنوردارکردن بەگەلێك رێبازی پێبیشنی،نەکراو، لەگەڵ یەکتر جیاوازن.)
M.Joos ed. Readings in Linguistic, American Concil of Learned Societies, Washington, 1957 p. 96

بەڵام هامبۆڵت زۆرجار پێی دادەگرت، لەسەر ئەوەی کە زمانەکان، لە رووی تایبەتمەندیی پێکهاتەی گشتییەوە خاوەنی یەك چوارچێوەن. من پێوایە ئەو لە نامەیەکدا کە بۆ **شلگلی** ناردووە، لەسەر ئەم رایە سوورە. (بڕوانە لیتزمان هەمان ل٥٤):

Dass alle Sprachen in Abischt der Grammatik sich sehr ahnlich sehen, wenn man sie nicht oberflach, sondern tief in iherem Innern untersucht, ist unlaugbar.

له کۆتایی دا، چەمکی زمـان لـه روانگـەی **هامبۆڵت** دا، دەبـێ بـه سـەرنجدانه زەمینەی نووسینەکانی تاوتوێ بکـەین، لەمـەڕ تیـوری کۆمەڵایـەتی و سیاسـی، هەروەها لەبارەی چەمکی سروشتی مرۆیی که بنەمای هەموو رایەکانه. **هامبۆڵت** وەك یەکێك له بەرجەسته ترین ئەڵمانی باوردار به مافی سروشتی دژی حکومـەتی دکتاتۆری، ناسێنراوە. ناوبراو دەسەڵاتی رەهاو هەر جۆره دوگمێـك رەت دەکاتـەوە و پشتیوانی مافه سەرەتاییەکانی مرۆیی کردووە، چونکه بڕوای وایه، گەشەکردن و کامڵ بوونی تاکایەتی مرۆڤ، لەلایەن کاری داهێنەرانـەی مانـادار و بیرکردنـەوەی ئازاد دەستەبەر دەکرێ:

**ئاساییه که ئازادی مەرجی پێویسته و بێ ئەو تەنانەت گیانبەخشـترین کارەکـان نـاتوانن گیانبەخشی خۆیان نیشان بدەن. هەر کارێك که مرۆڤ به ئارەزووی تەواوی خۆی هەڵینەبژاردبێ و هەر شتێکیش رێگەی لێبگرێ، تەنانەت ئەگەر رێنوێنیشی بکات، هەرگیز نابێته بەشێك له سروشتی ئەو و هەمیشه لەگەڵیدا بێگانه دەبێ و ئەگەر ئەنجامیشی بدات، بێ گومان به دڵ نییه، بەڵکو تەنیا وەك شارەزاییەکی میکانیکی ئەنجامی دەدات. (بڕوانه کوان ل٤٦ و ٤٧). (له حاڵەتی ئازاد بوون له کۆت و بەندی دەرەکی)... دەتوانین تێکڕای جوتیار و سنعەتکاران به هونەرمەند بزانین، واته ئەو خەڵکەی لەبەر خودی کارەکە ئاشقی کارەکەیانن و، به هێزی دەروونی و هەستی داهێنانی خۆیان کامڵی دەکەن و، لەم رێیەوە گەشه به هێزە زەینییەکانی خۆان دەدەن و، شکۆمەندی به کەسایەتی خۆیان دەبەخشن و پتریش رازی دەبن. لەم حاڵەتەدا،**

---

جگەلەوە ئەمه تەنیا تێورییه که لەگەڵ تیوری **ئیفلاتون** لەمەڕ زمان فێربوون هاوئاهەنگە. (cf. p. 64)

بۆ بەدواداچوونی پتر له بارەی بایەخی مێژوویی کاریگەریی **ڤیتینی** و، (به رای مـن) رەخنـەی تـەواو هەڵـەو سەرپێیی ناوبراو، بڕوانه:

Chomsky. Current Issues in Liguistic Theory

**هەر بەم شتانە کە سەرەڕای جوانییان ئەو سوك و چروك دەکەن، دەتوانن گەشە بە مرۆڤ بکەن. (هەمان سەرچاوە ل٤٥).**

تێرکردنی نەفس **جیا لە نیازە ئاژەڵییەکان**، سەرەکی ترین نیازی مرۆڤە. کەسێك لەوە تێنەگات (*گۆمانی ئەوەی لێدەکرێت کە لە سروشتی مرۆڤ تێناگات و لە هەوڵی گۆڕینی مرۆڤ دایە بۆ ئامێر. هـ س ل٤٢*). وەلێ کۆنترۆڵکردن لە لایەن دەسەڵاتەوە لەگەڵ نیازی مرۆڤ ناگونجێ، چونکە سەرکوتکەرە و لە ئاکامدا (*بە وەدیهێنانی وەك یەکی و هاوجۆری، کارەکانی خەڵك لەگەڵ کەسایەتیان نامۆ دەکات.* هـ س ل٤١). ئەم پرسە لەگەڵ جۆرێك هاوجۆری و هاوشێوەیی و لەگەڵ کردەوەی نامۆکردن هاوڕایە. لەبەر ئەم بەڵگەیە کە (*ئەقڵی ساغڵەم بارو دۆخێك قبوڵ ناکات، مەگەر لەو بارودۆخەدا هەر تاکێك خاوەنی ئازادی رەها و بێ کۆت و مەرج بێ، تا تاکایەتی واقعی خۆی لە درەوون دا پوختە بکا* . هـ س ل٣٩). لەسەر ئەم بنەمایە ئەو ئاگادارمان دەکاتەوە لە: (*ئەو ئاکامە زیانبەخشانەی ئاستەنك کردنی ئازادی تاك*) و (*ئەو مەترسییانەی لە بانگەشەی کردەوەی ئاینییەوە سەرهەڵدەدەن، کە بە هۆی دەوڵەتەوە دەکرێ.* هـ س ل١٣٠). هەروەها (*ئەو مەترسیانەی لە دەستێوەردانی دەوڵەت لە خوێندنی باڵا ، دێنە ئاراوە*. هـ س ل١٣٣)، یا رێکخستنی هەرجۆرە پەیوەندییەکی تاك (*وەك هاوسەرگیری. هـ. س ل٥٠*) و شتی تر. جگەلەوە بە بڕوای ئەو، ئەو مافانەی باسیان دەکەین تایبەت بە خودی مرۆڤن و، نابێ هەرگیز تایبەت بن بۆ (*چەند تاکێکی هەرنەتەوەیەك*). (*بیر کردنەوە لەوەی کە دەتوانین هێندێك مافی مرۆیی پشت گوێ بخەین، سوکایەتییەکی گەورەیە. هـ س ل٣٣*) بۆ ئەوەی نیشانی بدەین کە ئایا رێز بۆ مافە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ دادەنرێ، دەبێ نەك هەر ئەوەی تاك ئەنجامی دەدا تاوتوێی بکەین، بەڵکو دەبێ

مەرجەکانی ئەنجامدانیشی لەبەرچاو بگرین، بزانین ئایا ئەم کارە لە ژێر گوشاری دەرەکیدا ئەنجامدراوە، یا ئارەزووی خۆی بووە تا نیازە دەروونییەکانی تێر بکات؟ ئەگەر مرۆڤ بە شێوەی ئامێرێك كار بكات (*دەستخۆشی لەو شتە دەکەین کە ئەنجامی داوە وەلێ لە خودی ئەو کە هەیە بێزارین. هـ س ل٣٧*)[١].

---

[١]- مانای سیاسی تیوری **مافە سروشتییەکان** وەك رایەکانی تری هامبۆڵت، بەروونی پتر پەیوەندییان بەو میتۆدەوە هەیە، کە دیاری کراوە و ئەو تۆڕە کۆمەڵایەتییەی کە تێیدا دەردەکەوێ. نرخاندنی ئەم پرسانە لێرەدا دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی گەلێك پرسیار. کەڵك وەرگرتن لەو زاراوانەی کە هامبۆڵت بۆ لێکدانەوەکەی خۆی بەکاریان دێنێ، نیشاندەری هاوئاراستەییە، لەگەڵ کتێبی **دەسنووسەکانی ئابووری فەلسەفی** ١٨٤٤. (وەرگێڕاوی ئینگلیزی E.Fromm, ed, Marx s concept of لە T. B. Bottomore Man. New York, Ungar 1961) کە بەرهەمی **مارکس**ە. لێرەدا هێنانەوەی چەند وتەیەك لە زمانی مارکسەوە، هاوشێوەی رایەکانی **هامبۆڵت** لەگەڵ ئەودا بەباشی نیشان دەدات: (کاتێك کار بۆ کرێکار دەرەکییە... و بەشێك نییە لە سروشتی ئەو...و ئەو بە کاری خۆی، خۆی رازی ناکا، بەڵکو نکۆڵی لە خۆی دەکات و لەرووی جەستەوە ماندوو، لە رووی روحیشەوە، پوچەڵ دەبێتەوە، دەبێتە هۆی لەخۆنامۆبوونی کرێکار. ل٩٨). پێویستی بەکار لە **چالاکیی ئازاد و ئاگاهانەدا**. (ل١٠١) لە **خەسڵەتەکانی بوونی مرۆڤە** و بە نامۆ بوون لەکار، لەبەشێکی بوونی خۆی بێبەش دەبێ. بەهۆی پێداویستییەوەیە کە (هێندێك کرێکار ناچار دەبن کاری قورس و ئاژەڵی بکەن و هێندێکی تریان دەبن بە ئامێر. ل٩٧)، هەروەها ئاماژە بەناوبانگەکەی مارکس بە شێوەی باڵای کۆمەڵگا کە لە وێدا (کار نەك هەر تەنیا هۆکارێکی ژیانە، بەڵکو باڵاترین ئامانجی ژیانیشە.) Crittique of the Gotha Programe 1875. دەتوانین جەخت کردنەوەی **هامبۆڵت** لەگەڵ رەخنەی **رۆسۆ** لە ئۆرگانە کۆمەڵایەتییە نوێیەکان، بەراورد بکەین:

Discourse on the Origins and Founations of inequality among men (1755) 

وەرگێردراوە لە R. D. Masters. The first and second Discourses, New York, St. Martins [1964] 

ئامانجی **رۆسۆ** (نیشان دانی سەرچاوە و پەرەسەندنی نایەکسانی گەندەڵی کۆمەڵگا سیاسییەکانە، بە شێوەیەك کە بتوانێ سەرهەڵدانی ئەوانە بە پەنابردنە بەر لۆجیك بسەلمێنێ، بێ گەڕاندنەوەیان بۆ سروشتی مرۆڤ و، سەربەخۆ لەو دۆگما پیرۆزانەی، کە دەسەڵاتی فەرمانڕەوا بە مافی ئیلاهی دادەنێن. ل١٠٤)ز ناوبراو لە

چوارچێوەی ئەندێشەی دیکارتی دا، ئاژەڵ بە تەنیا ئامێری بلیمەت دەزانــێ، کــە سروشــت هەســتەکانی پــێ بەخشیوە تا خۆی پێبگەیەنێ و، خۆی بپارێزی لەو شتەی دەیەوێ سەغڵەتی بکا یا لە نــاوی بــەرێ). ( هــەر ئاژەڵێك لەبەر ئەوەی خاوەنی هەستە بیروبڕوای هەیە و تەنانەت بیروبڕوایەکانی تارادەیەکی دیاریکراو، ئاوێتە دەکات و لەم رووەوە مرۆڤ تەنیا جیاوازییەکی کەمی لەگەڵ ئاژەڵەکانی تردا دەبێــت (بڕوانــە یاداشــتی ١٣). ئەوەی کە مرۆوڤ و ئاژەڵ بە تەواوی لێکجیا دەکاتەوە، ئەمەیە کە مرۆڤ **توخمێکی ئازادە** و **ئاگادارە لە ئازادی خۆی**. (جیاوازییەکی گرینگی تر کە دەکرێ سەرچاوەکەی بە ئازادی مرۆڤ بزانین، **توانای خۆچاکســازییە** هــەم وەك تاك و هەم وەك جۆرێکی بوونەوەر). هەرچەندە دەتوانین زۆربەی لایەنەکانی سروشتی مــرۆڤ بگەڕێنینــەوە بۆ خەسڵەتەکانی مرۆڤی ئامێریی، وەلێ رەفتاری مرۆڤ، لە لێکدانەوەی میکانیکی بەدەرە، (چــونکە زانســتی فیزیك میکانیزمی هەوێنبوونی وێناکان نیشان دەدات، بــەڵام لــەو هێــزەی ئــیرادە و هــەروەها هەســتەکان و سۆزدارییەکان، کردە مەعنەوییەکاندا دەدۆزرێنەوە، کە یاسا میکانیکییەکان هیچ روون کردنەوەیەکیان بۆیان نییە. پەراوێز ل١١٣).

رۆسۆ بەم وێناکردنە بنەما دیکارتییە، لە سروشتی مرۆڤەوە تیوری و نرخاندنی خــۆی بــۆ کۆمــەڵگا نوێکــان دەخاتە روو: لە وێوە کە ئازادی والاترین توانایی مرۆڤە، تــاك بــە چاوپۆشــی لــە ئــازادی و خــۆ ســپاردن بــە ئارەزووەکان، ئەربابێکی شێتو تووڕە، سروشتی خۆی تێکدەدا و خۆی تا ئاستی ئاژەڵەکان دادەبەزێنێ، کە بــە شــێوەی غــەریزی بوونەتــە کۆیلــە. ل١٦٧). دەوڵــەتی نەتــەوەیی و رێکخــراوی کۆمەڵایــەتی نــوێ و یاســا نەریتییەکان، هەموویان رەگ و ریشەیان لە پیلانێك دا هەیە کە زۆرداران و دەسەڵاتداران بۆ ئۆرگانیزە کردن و پاراستنی موڵك و دەسەڵاتی خۆیان کۆیان کردۆتەوە، پیلانێك کە (لاوازی لاوازتر و بەهێزی بەهێز تر کــرد، ئازادی سروشتیشی بۆ هەمیشە لەناوبرد، یاساکانی سامان و نایەکسانی بۆ هــەتا هەتایــە ســەقامگیر کــرد، تالانکردنی بە مافێك دانا کە سەندنەوەی بۆ نییە و، بەهۆی بەرژەوەندی مشتێك مرۆڤی چاوچــنۆك، رەگــەزی مرۆڤی مەحکوم بە بەدبەختی و کۆیلایەتی و چەوساندنەوە کرد). لەکۆتایی دا بە کەوتنــە ســەرپێی دەوڵــەتی نەتەوەیی (مرۆڤە هەرە ئابڕوومەندەکان بەئەرکی خۆیان زانی مرۆڤەکانی تر بکــوژن و دواتــر هــەزاران مــرۆڤ بوونە قوربانی، بێ ئەوەی بزانن بۆچی؟. ل١٦٠ تا١٦١). تا ئەو کاتەی کۆمەڵگا مافی موڵکایەتی و دادوەری و دەسەڵاتی گرێبەستی بە فەرمی دەناسێ، یاسای سروشتی هەر پێشێل دەکرێ. ل١٦٨ بەدواوە). ئــەوەی کــە (ژمارەیەك هەموو دەسەڵات و ناز و نیعمەتێکیان هەبێ، بەڵام هەزاران کەس لە سەرەتایی تــرین پێداویســتی ژیان بێ بەش بن) پێچەوانەی یاسای سروشتییە (ل١٨١). (هەر کەســە قــازانجی خــۆی لــە بەدبــەخت کردنــی ئەوانی تردا دەبینێتەوە. ل١٩٤). (قازییەکان بڕیاریان داوە کە منداڵی کۆیلە هــەر لــە دایــك بوونییــەوە بــە کۆیلە دادەنرێ. ل١٦٨). مرۆڤ بۆتە **بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی** و لە **دەرەوەی خۆی** دەژی و مانــای ژیــانیش، تەنیا لە بیرورای ئەوانی تردا دەدۆزێتەوە. ١٧٩). (مرۆڤ دەتوانێ مرۆڤایەتی واقعی، تــەنیا بــە لــە نــاوبردنی

کەواتــە روونــە، جــەخت کردنــەوەی **هامبۆڵــت** لــە ســەر لایــەنکانی خــۆکرد و داهێنەرانەی کەڵك وەرگرتن لە زمان، ریشەی لە چەمکێکی گشتی تری **سروشــتی مرۆیی** دایە، ئەو چەمکەی کە خۆی داینەهێناوە و بــە شــێوەیەکی جــوان پــەرەی پێداوە و گەشەی پێکردووە.

هەروەك لە سەرەوە باسکرا، هەوڵەکانی **هامبۆڵت** بۆ نیشاندانی شــێوەی ئۆرگــانی زمان - سیستمی بەرهەمهێنی یاساو بنەماکان کە هەر یەك لــە تــاك توخمــەکانی دیاری دەکات- بە هەڵبواردنێکی گرینگ لە زمانناسی نوێ، کارگەرییەکی کــەمی هەبوو. جەخت کردنەوەی پێکهاتەگەرایان لەسەر زمــان وەك **دەزگایــەکی لــەخۆوە هەبوو**[1]، لانیکەم لە روانگەی چەمکەوە، راستەوخۆ کەوتۆتە ژێر کاریگەری **شێوەی ئۆرگــانی** زمانناســی هــامبۆڵتی. بــە بۆچــوونی هامبۆڵــت، نــاتوانین زمــان وەك کۆمەڵێك تــاکی لێکجیــا لەبــەر چــاوبگرین (*واتــە زاراوەکــان، دەنگــەکان، تــاك بەرهەمی وتــە و هــیتر*)، بــەڵکو دەبــێ بــە ئۆرگــانیزمێکی بــزانین، کــە هــەموو بەشــەکانی پێکــەوە بەنــدن، و رۆڵــی هەریــەکیان لەســەر پەیوەنــدی بــە پرۆســەی بەرهەمهێن، دیاری دەکرێ، کە پێکهێنەری شێوەی سەرەتاییە. لــە **زمانناسی نوێ** دا، کە سەرنجی خۆی لە پێڕستی توخمەکان و **نموونە** نەگۆڕەکان دا کورت کردۆتەوە، واتای چەمکی **شێوەی ئۆرگانی** لە واتای چــەمکی **شــێوەی ئۆرگــانی** هامبۆڵــت سنووردار ترە. بەڵام تەنانەت لەم چوارچێوە سنوردارەشدا، بە شێوەیەك کــەڵك لــە

---

حاڵەتی، هەژار و دەوڵەمەند، دەسەڵاتدار و بێ دەسەڵات، کۆیلە و خاوەن کۆیلە، بە شورشێکی نوێ، کــە بــە یەکجاری دەوڵەت لە ناو دەبات یا دەیکا بە ئۆرگانێکی رەواتر، بــە دەســدێنێ. ل٧٢) (ئــەو راپەڕینــەی کــە دەبێتە هۆی خنکاندن یا روخاندنی سوڵتانێك، هەر ئەوەندە رەواو یاساییە، وەك ئەو فەرمانانەی ئەو ســوڵتانە رۆژی پێشتر، لەمەڕ گیان و سامانی لایەنگرانی خۆی، دەری کردبوو. ل١٧٧)

[1]- دەکرێ بڵێین دەزگایەکی خۆڕسك.

چەمکی **هاوپەیوەندی ئۆرگـانی**[١] وەرگـیراوە، لـەوەی هامبۆڵـت مەبەسـتی بـووە بەولاوەتریش چووە. لە **پێکهاتەگەرایی نوێ**[٢] دا، گریمانەی باو ئەمەیە، کە دەزگای دەنگسـازی تـەنیا کۆمـەڵێکی خۆرسـك و مـۆرفیمی لێکجیـا نییـە، بـەڵکو ئۆرگانیزمێکی تەواوە کە ئەو مۆرفیمانەی ئەندامی ئەون و پێکهاتەکەی پەیڕەوەی بنەما و ڕێسای تایبەتە) . ئەم بۆ چوونانە ناسراون و من روون کردنـەوەی پـتر لـە بارەیاندا نادەم.

هەروەك لەسەرەوە بینیمان، لە روانگەی هامبۆڵتەوە **شێوەی زمان**، یاسا دەستوورییەکان و زاراوە رۆنان و فۆنۆلۆجی، هەروەها ئەو یاسانە دەگرێتەوە کە دەزگای خولقێنەری چەمك و زاراوەکان دیاری دەکات. ناوبراو جیاوازییەکی تر دادەنـێ، لـە نێـوان **شـێوەی زمـان** و ئەوەی پێی ئەو پێی دەڵێ **کەسایەتی زمان**[٣]. بـە رای مـن هـەروەك خـۆی ئـەم زاراوەی بەکارهێناوە، کەسایەتی زمان، میتۆدی کارایی زمان بە تایبەتی لە هۆنراوە و فەلسەفەدا دیاری دەکات و دەبێ **کەسایەتی دەروونی**[٤] (ل٢٠٨) زمان، لە پێکهاتـەی رستەسـازی و مانایی جیا بکرێتەوە، بە تایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە شێوەوە هەیە نەك پڕاکتیك. (بەبێ ئەوەی گۆڕانێك لە دەنگەکانی زمان وەدی بێنین، دەبینین زمان بـە هـۆی هـزری کـامڵی خاوەنەکەی و هێزی باڵای بیرکردنەوەی، هەروەها توانای تێگەیشتنی قـووڵ و بـەرفراوان، شتێك دەردەبڕی کە پێشتر لە وێدا بوونی نەبووە. ل١١٦). کەواتە نوسـەر یـا بیرمەنـدی گەورە، دەتوانێ بێ گۆڕینی پێکهاتەی دەستووری زمان، کەسـایەتی زمـان بگـۆڕی، یـا شرۆڤە کردنی ماناکانی زمان دەوڵەمەندتر بکات. کەسایەتی زمان پەیوەندییەکی نزیکـی

---

[1] -organic interconnection

[2] -New Stracturalism

[3] -character language

[4] -inner character

هەیە لەگەڵ توخمەکانی تری کەسایەتی نەتەوەیی و ئەمەش داهێنانێکی تەواو تاکییانەیە. **هامبۆڵتیش** هاوشێوەی لایەنگرانی دوای **دیکارت** و قۆناغی رۆمانتیك، خۆی بڕوای وابوو کە کردەوەی ئاسایی زمان بە گشتی کردەی داهێنەرانەی زەین دەگرێتەوە، وەلێ کەسایەتی زمانە، نەك شیوەکەی، کە دەرخەری **داهێنەری** واقعییە لە چەمکێکی بالآتردا، چەمکێك کە هەم باسی بەهاو هەم داهێنان دەکات.

**هامبۆڵت**، جگە لەو هەموو بایەخەی دەیدا بە لایەنی داهێنەرانەی پراکتیکی زمانیی، هەروەها بە شێوە لە پرۆسەی بەرهەمهێن دا، باسی پرسێکی بنەمایی ناکات کە: بە وردی تایبەتمەندی شێوەی ئۆرگانیی لە زماندا چییە؟ تا ئەو جێگایەی من بزانم، ئەو هەوڵ نادا دەستوورێکی بەرهەمهێنی تایبەت بێنێتە ئاراوە، یا خەسڵەتە گشتییەکانی دەزگایەکی ئاوا، واتە ئەو خەسڵەتە هاوبەشە گشتیانەی هەر دەزگایەکی دەستووری هەیەتی، ئەژمار بکا. لەم رووەوە دەسکەوتە زمانییەکانی ئەو، ناگاتە دەسکەوتی هەندێك لە پێشینانی خۆی. کاری ئەو کەموکوڕیەکی تریشی هەیە، ئەویش ئەوەیە، کە چەندین پرسی بنەڕەتی بە نادیاری هێشتۆتەوە، لەوانە، جیاوازی دانەناوە لە نێوان، داهێنانی یاسامەند کە کردەی رۆژانەی زمان دەگرێتەوە و هیچ گۆڕانێك بەسەر شکلی زماندا ناهێنێ لە لایەك و، ئەو جۆرە داهێنانەی کە دەبێتە هۆی گۆڕانی پێکهاتەی دەستووری لەلایەکی تر. ئەم کەم و کوڕییانە پێشتر ناسراون و لە بەرهەمە نوێیەکاندا تارادەیك، بنبڕ کراون. سەرەڕای ئەوە لە باسەکانی دا دەربارەی پرۆسەکانی بەرهەمهێن لە زماندا، زۆرجار دیار نییە کە ئەوەی بە زەینی دا تێدەپەڕێ، ئایا **توانایە** یا **کردەی** زمانییە. (*یەکەمین یا دووەمین پلەی هەوێنبوونی شێوە لای ئەرستۆ.* ***لە بارەی نەفس دا***، *کتێبی دووەم بەشی ١* ). لەبەرهەمە نوێیەکاندا دووبارە جەخت لەسەر ئەو جیاوازییە نەریتییە کراوەتەوە (*بگەرێوە بۆ پەراوێزی ل١١ ژ١ و پاشکۆکانی*). چەمکی دەستووری

بەرهەمهێن لە واتای نوێ دا، پەرەسەندنی هەمان **شێوەی زمانی** هامبۆلتە، بەو مەرجەی **شێوەی زمان** بە چەمکی **بەردەوام بوونی زمان** بزانن، نەك بە **كارگێڕی پراكتیكی زانست** بە پێی رایەكانی **ئەرستۆ**.

دەبێ ئاگادار بین، كەموكوڕی لە تۆماركردنی ڕێساكانی دروستكردنی وردی رستەدا، تەنیا دەرئەنجامی كەمتەرخەمی زماناسانی دیكارتی نەبووە. ئەم كارە تاڕادەیەك ئاكامی ئەم گریمانە ئاشكرایە بوو كە ریكخستنی وشەكانی رستەیەك (*لانیکەم لە زمانە **خۆش پێکهاتەکاندا***[1] *- دەتوانین بڵێین رستەی سادە* یائاسان، و/ كوردی) لەگەڵ ڕەوتی بیركردنەوەدا

---

[1]- well-designed" language وێدەچی ئەم چەمكە بە هۆی جەنجاڵی لەبارەی كەڵك وەرگرتن لە زمانی وتووێژ لە بری زمانی لاتین، كەوتبێتە سەرپێ:

F. Brunot, Histoire de la Language Francaise, Paris, Librarie Armand Colin, IV (1924) PP. 1104 f., and G. Sahlin, Cesar Chesneau du Marsais et son role dans l evolution de laGrammair generale, Paris, presses- Universitaires, (1928) pp. 88-89 

هەندێك سەرچاوەی سەرەتایی، لەوانە سەرچاوەیەكی ساڵی ١٦٦٩، لە بارەی سروشتی بوونی زمانی فەرنسی دا تا ئەو جێگایە رویشتووە كە بڵێ: رۆمییەكان بە زمانی فەرەنسی بیردەكەنەوە، بەڵام بە زمانی لاتینی دەدوێن). **دیدرۆ** ئەوەندە لە سروشتیی بوونی زمانی فەرەنسی دڵنیایە، كە بۆ زانست بە گونجاتری دەزانێ وەك لە ئەدەبیات، چونكە زمانەكانی تری ئەوروپایی كە لەرووی ریكخستنی وشەكانەوە **ناسروشتین،** بۆ لێكدانەوەی سەرەتایی گونجاوترن (Lettres sur les sourds et muets, 1751) ئینگلیزەكان لەم بارەوە رای جیاوازیان هەبوو. بۆ نموونە **بینتهام** بڕوای وابوو كە (زمانی ئینگلیزی لەناو زمانە ناسراوەكاندا...پێگەیەكی ئەوەندە باشی هەیە، كە دەتوانین گرینكترین تایبەتمەندی پێویستی هەر زمانێكی تێدا بدۆزینەوە). بڕوانە:

Work edited by J. Bowring, New York, Russell Inc., 1962 vol VIII. P. 342.

**هوارتە** لە كۆتایی سەدەی شانزەهەمدا نووسیویەتی: (لە بەراوردكردن و هاوڕێككردنی زمانی لاتین و نەفسی ئاخێوەر) دا، زاراوەی لاتینی و شێوەی ئاخاوتنی ئەم زمانە ئەوەندە لۆجیكییە، ئەوەندە گوێ لێگرتنی خۆشە، كە ئەو نەفسە ئاخێوەرەی بەهۆی پێویست بوون بە زمانێكی رەوان بۆ داهێنان، یەكسەر زمانی لاتین هەڵدەبژێرێ. ه س ل١٢٢).

لە سەدە حەڤدەهەم بەدواوە باس و خواسێكی فراوان دەستی پێكرد، لەبارەی توانی داهێنانی (زمانی فەلسەفی) كە بنەماكانی بیركردنەوەی باشتر بێ لە زمانەكانی تر. هۆگری بۆ ئەم پرسە، بەرواڵەت سەرچاوەی

پەیوەندییەکی راستەوانەی هەیە و، لە ئەنجامدا ناتوانین لە باسەکانی دەستووردا تاوتوێی بکەین. لە کتێبی **دەستووری هاوبەشی گشتی و سەلماندن** دا هاتووە: بە کەڵك وەرگرتنی مجازی لە زمان نەبێ، دەستووری زمان لەمەڕ رێسای دروستکردنی رستە، شتێکی ئەوتۆی بۆ وتن پێ نییە (ل١٤٥). کەمێك دوای ئەوە لە وتارەکەی **لامی** دا لابردنی ئەو روونکردنەوانەی پەیوەندییان بە (*رێکخستنی زاراوەکان و ئەو رێسایەی پێویستە لە نەزم و رێکخستنی ئاخاوتن دا بپارێزرێ*) لەسەر ئەم بنەمایە پاساویان بۆ دەهێنرێتەوە، کە (*تیشکی سروشتی و بێگەرد، ئەوەی پێویستە ئەنجام بدرێ زۆر بەروونی نیشانی دەدا*[1]. *ل٢٥*). کەواتە ئیتر پێویست بە هیچ روونکردنەوەیەکی زیاتر ناکات. تارادەیەك هەر لەو سەردەمەدا **ئوسقوف ویلکینز**[2]، دوو جۆر پێکهاتەی دیاری کرد: ئەوانەی کە زاراوەیین (*پاژنە هەڵکێشان و دەرباز بوون، خۆدزینەوە لەدین، بە چۆکداهاتن و هتر*) و ئەوانەی پەیڕەوی (*تێگەیشتن و رێخستنی ئاسایی زاراوەکان*) دەکەن و لە ئاکامدا پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی تایبەت نییە (ل٣٥٤). بۆ نموونە دەتوانین رێکخستنی بکەر - کار- بەرکار

هۆگری **لایب نیتس**ە بۆ **دەستووری سروشتی** کە بە وتەی ئەو دەتوانێ **لایەنە بالآکانی زمان** دەربخا. بۆ بەدواداچوونی پتر لەم بارەوە بڕوانە:

Couturat & Leau. Historic de la langue unjverselle (1903): Margaret M, C. Mclntosh The phonetic and Linguistic Theory of fhe Royal Society School, Oxford University (1956): Cassirer, The Phjlosophy of Symbolic Forms.

1 -B. Lamy, De *l* Art de Parlre (1676)

لەگەڵ ئەمەشدا، چەندین بەڵگەی شێوازناسی لە ئارادایە، کە دەکرێ **رێکخستنی سروشتی** زۆربەی زمانەکان بگۆڕدرێن، بەلام نەك لە زمانی فەرەنسی دا، کە بە وتەی ئەو کەڵك لە **شێوە مەجازییەکانی دەستوور** وەرناگرێ، چونکە، (ئەم زمانە بەدوای سادەیی و رەوانییەوەیە، هەر لەبەر ئەمەیە تا ئەو جێگایەی بکرێ، هەمووشتێك بە سروشتی ترین نەزم و بە سادەترین شێوە دەخاتە روو. ل٢٣).

2 -J. Wilkins,an Eassy towards a Real Character and a Philosophical Language (1668)

یا بکەر - پێتی پەیوەندی- ئاوەڵکار وەیا ڕێکخستنی پیتـە زیـادە **دەسـتووری** و **مانـایی** یەکان و لەبارەی ئەو بابەتانەی پێیانەوە بەندن و هیتر، ناو ببەین (ل٣٥٤).

لە بەرامبەرئەم خاڵەدا، بۆچوونی **نەزمی سروشتی**[1]، ڕوانگەی گرێبەست کە دەڵـێ: هـەر زمانیـــك کۆمـــەڵێکی گرێبەســـتی **نموونـــەکان**[2] دەگرێتـــەوە و، ئـــەم نموونانـــەش بـــە دووبارەبوونەوەی بەردەوام (*هەروەها بـە گشـتگیرکردن*) فێریـان دەبـین و، دەبێتـە هـۆی دروستبوونی (*کۆمەڵێک خووخدەی گوفتـاری*). ئـەم بۆچـوونە کـە دەتـوانین پێکهاتـە و کاریگەری زمان، تا ڕادەیەك لەسەر ئەو بنەمایە ڕوون بکەینەوە، ڕێخۆشـکەری زۆربـەی لێکۆڵینەوە نوێیەکان بووە لەمەڕ زمان و خووە گوفتارییەکان، کـە زۆرجـار لێکدانـەوەی بریـارە گشـتییەکانی لەمـەڕ ڕستەسـازی تێکـڕای زمانەکانـدا، ڕەت کردۆتـەوە. ئـەم ڕوانگەیە، وەك ئەو بۆچوونەی پشت بە گریمانەی ڕێکخستنی سروشتی دەبەستێ، دەبێتـە هۆی هەوڵ نـەدان بـۆ دۆزینـەوەی **شـێوەی دەسـتووریی** زمـانی جۆراوجـۆر، هـەروەها پێشگرتن لە دەربڕینی پڕۆژەیەکی ئەبستراکت و هاوبەش بۆ هەموو زمانەکان[3].

بە کورتی یەکێك لەو دەسکەوتە گرینگانەی، کە ئێمە ناوی دەنێین **زمانناسی دیکارتی**، ئەم بۆچوونەیە: زمانی مرۆڤ بە بـەراورد لەگـەڵ زمانشـێوەی ئـاژەڵ، ئـازادە لـە کـەڵك وەرگرتنی سروشتییانە لە دەسەڵاتی بزوینەرە دەرەکییەکانی سەربەخۆ لە هـەل و مەرجـە دەروونییەکان و، پەیوەست نییە بە هیچ کردەیەکی پەیوەنـدی و کردەیـی زمـان. کەواتـە

[1] -natural order

[2] -patterns

[3]- لەگەڵ ئەمەشدا، بە پێچەوانەی ئەم بڕوایە، کە دەکـرێ زمانـەکان لـە سـەر بنـەمای **خـوو** یـا **پاڵنـەر** و **وەڵام**، لێکبدەینەوە، یا پێکهاتەی ڕستەسازی زمان، کە پێڕستێکی نموونەکانە، گریمانەی **ڕێکخستنی سروشـتی** ئـەم لایەنـە باشەی هەیە، کە لە ڕووبەڕووبونەوەی پێشهاتە کان یەکی ناکـەوێ. لەبـەر ئـەوە ئـەم ئەگـەرە ڕەت ناکرێتـەوە، کـە دەتوانین **ڕێکخستنی سروشتی** دیاری بکەین و وەك گریمانەیەك لەمەڕ پێکهاتەی زمان بیخەینە ڕوو.

زمان، بە ئازادی وەك هەر ئامرازێك بۆ خۆدەرخستن و بیرکردنەوەی ئـازاد، کـار دەکـات. توانا بیٚ سنوورەکانی بیرکردنەوە و خەیاڵ، لە لایـەنی داهێنەرانـەی کـەڵك وەرگـرتن لـە زمان دا، خۆی دەنوێنیٚ. زمان ئامرازێکی دیاری کراو دەخاتـە بەردەسـت، وەلیٚ توانـای لێکدانەوەی بیٚ سنوور پێشکەش دەکـات. تـەنیا رێسـاکانی دروسـت کردنـی چـەمك و رستە، ئەم توانایانـە دیـاری دەکـەن. ئـەم رێسـایانە تـا سـنوورێکی تایبـەتی و تـاك، تاسنووری هاوبەشی گشـتی، لـە بـەهرە گشـتییەکانی مرۆڤایـەتین. سـیمای تارادەیـك پێناسەکراوی هەر زمانێك - یا بە زمانی ئەمرۆکە **دەستووری بەرهـەمهێن**- یەکییـەتی ئۆرگانی پێکدێنیٚ، کە توخمە سەرەکییەکانی ئەو زمانە پێکـەوە دەبەسـتێتەوە، ئەمـەش بنچینەی هەریەك لەو دەرکەوتە بیٚ سنوور و لە ئەژمار نەهاتووانەی زمانە.

روانگەی زاڵ لە تێکڕای ئەم قۆناغەدا ئەمەیە، کە ***زمان گرینگترین ئاوێنەی روحی مـرۆڤە***[1]. بـە یەکسـان دانـانی پروسـە زەینـی و زمانییـەکان، بابەتێکـە تاقیکردنەوەکانی **دیکارت** دەکاتە پاساو بۆ سەلماندنی هەبوونی زەینگەلی تر. ئـەم روانگەیە بە درێژایی قۆناغی رۆمانتیکی لاینەگرانی خـۆی هـەبوو. لـە روانگـەی **فریدریك شلگل** ەوە ( بیرکردنەوە و وتە ئەوندە بەیەکـەوە بەسـتراونەتەوە کـە وەك خودێکی یەك دانەن، کە ئێمە بـیٚ دوودڵـی، بـیرو هـزر بـە مـافی خـودی مـرۆڤ دادەنێین. هەروەها دەتوانین زاراوەکان بە پێی ماناو گرینگی و پێگەیان بە بەشـێك

---

[1] -Leibniz, Nouveaux essays sur lentedenment humain. Book III, chap. VII; translated into English by A. G. Langley, La Salle, Illinois, Open Court Publishing Co.

هەروەها بڕونە رایەکانی لایب نیتز لەمەڕ زمان:

H. Aarslef, Leibniz on Lock on Language "American Philosophical Quarterly vol I. No.3. pp 1-24 (1964).

له سروشتی مرۆڤ بزانین)[١] . ئێمه له ئەنجامگیرییەکانی **هامبۆڵت** دا بینیمان، **هێزێك که زمان بەرهەمدێنێ لەو هێزە جیاناکرێتەوە کە دەبێتە هۆی بیرکردنەوە.**

دەنگدانەوەی ئەم روانگەیە تا ماوەیەکی زۆر جێگیر بوو[٢]، وەلێ بەرەبەرە بە گەیشتینی سەردەمی نوێ رەنگدانەوەکەی کاڵ بۆوە.

پێویستە بزانین کە بە یەکسان دانانی زمان و زەین، لە قۆناغە سەرەتایی و کۆتاییەکانی سەردەمی لێکۆڵینەوەی ئێمە، بە شێوەیەکی جیاواز لەبەرچاو دەگیرا.

---

[1] -F. Schlegel, Gesch der alten und neuen Literature (1812)

هەروەها بڕوانە:

A. W. Schlefel, "De L etymology en general "in E. Bocking (ed) Oeuvers ecrites en Francais, Leipzig (1846) p. 133 :

(زۆرجار وتراوە، کە **دەستووری لۆجیکی** پڕاکتیکییە، لەوەش بەولاوەتر، مانای جۆرێك شیکردنەوەی قووڵ و لەبار و **بان سروشتی** هزرە).

[٢] - هێندێك جار لەچەند سەرچاوەی چاوەڕوان نەکراو، بۆ نموونە، لە داخوازی **پرۆدۆن** بۆ ئەکادیمیای **بسانسۆن** (Besanson) لە ساڵی ١٨٣٧ هاتبوو، کە ئەو دەیەوێ دەستوورێکی هاوبەشی گشتی بێنێتە ئاراوە کە ( ... دەروونناسی بەشە نوێیەکان و فەلسەفە بە دوای چەند رێگەی نوێ دا بگەڕێن، سروشت و میکانیزمی زەینی مرۆڤ، لە بەرجەستەترین و هەستیارترین توانای ئەودا، واتە لە گوتار دا تاوتوێ بکا و لەسەر بنەمای نموونەکانی زمان، سەرچاوەی باوەڕەکانی مرۆڤ دیاری بکات، و بە کورتی دەستوور زمانیی بخاتە روو، کە لەوێدا بنەما ئەبستراکتەکان و زانستی ئەخلاق رەنگ بدەنەوە و، بیرکردنەوەیەك جێگیر بکا کە ببێتە پاڵنەری لیورێژبوونی بلیمەت.

(Correpondance de P. J. Proudhon, vol. I, edited by J. A. Langlois, Paris, Librarie Intrenationale, 1875, p. 31).

هەروەها **ج. س. میل** دەڵێ:

دەستوور...سەرەتای شێکردنەوەی پرۆسەی بیرکردنەوەیە. بنەماو رێساکانی دەستوور، ئامرازێکن کە شێوەی زمان بەهۆی ئەوانەوە لە شێوەگەلی هەمەکی و گشتی بیرکردنەوە هاورێك دەبێ. جیاوازی دانان لە نیوان بەشە جۆراوجۆرەکانی وتە، و لە نیوان حاڵەت و روو و کاتی کراەکان و کردەوەی پێتە لکاوەکان، لە راستیدا جیاوازی دانانە ل لە نێوان بەشەکانی بیرکردنەوە نەك بەشەکانی زاراوە... . **پێکهاتەی هەر رستەیەك وانەیەکە لە زانستی لۆجیك.** گۆڕانکاری جیاواز و هیتر، لە سەر بنەمای پێکهاتەی قووڵتری، زمان رەنگدانەوەی بیرکردنەوەیە، دەتوانین ئەوانە لە بەرهەمەکانی **فیرگە** و **راسیل** و کارە سەرەتاییەکانی **وتگشتاین** دا بەدی بکەین. ئەمە بابەتێکی تەواو روونە لێرەدا باسی ناکەم.

له سەر بنەمای بۆچوونەکانی سەرەتای زمـان، پێکهاتـەی زمـان ئەوەنـدە لەگـەڵ پێکهاتەی بیرکردنەوەی لێکدرابوو کە (*زانسـتی زمـان هـێچ جـۆرە جیاوازییـەکی لەگـەڵ زانسـتی بیرکردنـەوەدا نـەبوو*. **بـوزە** ل١٠). لایـەنی داهێنەرانـەی کـەڵك وەرگرتن لە زمان لەسەر ئەم گریمانەیە روون دەکەنەوە[١]. ئـەم روانگەیـە کـە زمـان ئامرازی دەربڕینی بـیرو هـزرە، بـەم شـێوەیە دووبـارە کرایـەوە کـە زمـان رۆڵـی بنیاتنەری بیرکردنەوە دەگێڕی. بۆ نموونە **لامیتری** لە باسکردنی ئەوەی کە مێشـك ئەو وێنانەی ئێمە دەیانبینین، چـۆن لەگـەڵ یـەکتر بـەراوردیان دەکـا و پێکیانـەوە دەبەستێتەوە، بەو ئاکامە دەگات کە *مێشك بە جۆرێکە، هەرکە هێما و شتەکان و جیاوازی نێوانیان، دەرکەوتن یـا لـە مێشـکدان نەخشـەیان بکێشـرێتەوە، ویـژدان بەئەرکی خـۆی پەیوەنـدی نێوانیـان تـاوتوێ دەکـا*،[٢] *ئـەو تـاوتوێ کردنـەش بـێ*

---

[١]- لـە راسـتیدا ئـەم خاڵـە باسـی ئـەم بابەتـە ناکـا کـە بیرکردنـەوەی داهێنەرانـە دەبـێ بـە چ شـێوازێك بێتە ئـاراوە و لێکۆڵینـەوە لـەم بـارەوە هـەروەك ئـەمڕۆ دەڵـێن، قـەناعەتهێن نییـە. بـۆ نموونـە کۆردۆمـوا (ئەو بیرو هزرانەی بـە زەینـی ئیمـەدا تێدەپـەڕن، بـێ ئـەوەی تێیـان بگـەین یـا لـە وتووێـژی مرۆڤەکانـدا ناگەڕێنرێنـەوە بـۆ شـتێك) دەگێرنـەوە بـۆ ئیلـهام واتـە پەیوەنـدی کـردن لـە رێگـەی رەوتـەکانی دەرەوەی جەسـتە. هـ. س. ل١٨٥ و ١٨٦). لـەو سـەردەمەدا زۆر کەسـی تـر بڕوایـان وابـوو، هەرچـۆنێك بـێ (مرۆڤ هەێندێك خەسڵەتی ئیلاهی، بە شاراوەیی لە توانا ئەقڵییەکەی خوی دا هەیە). بڕوانە:

Herbery of Cerbury, De Veritate 1624, p 167

ژمارەی لاپەڕەکان لێرەدا و دواتر، پەیوەندیان بە وەرگێڕاوی ئەم بەرهەمەی خوارەوە هەیە:

M. H. Carre, Univerity of Bristol Studies No 6, 1937.

دەبێ ئەم خۆبەستنەوەیە بە بـان سروشـتەوە، کـە لـە پێشـینەی بیرکردنـەوەی نـوێی ئیفلاتـوونی دا زینـدوو کراوەتەوە، لەبەرچاو بگرین، کە لە سەدەی شەشەم تا دەرکەوتنی رۆمانتیزم باو بوو، لەسەر ئەو بنەمایـە لـە تیورییەکانی زیندەوەرناسی دا، لایەنی داهێنەرانەی مرۆڤیان بە بەشێك لە (صفات)ی ئیلاهی دەزانی. بۆ بـە دواداچوونی پتر بڕوانە **لاڤجۆی** و **ئابراماز**. هەمان سەرچاوە.

[٢]- لە بیرمان نەچێ، لە روانگەی **لامیتری** یەوە، **نەفس** جەوهەرێکی بەش بـەش نییـە، بـەڵکو (لـەوێوە کـە تواناکانی رووحی تارادەیەکی زۆر، پەیوەندییان بە پێکهاتەی گونجـاوی مێشـك و تێکـڕای جەسـتەوە هەیـە،

*دۆزینەوەی نیشانە یا هێماکانی زمان، مەحاڵە. هـ. س ل١٠٥)*. پێش دۆزینــەوەی یا پشکنینی زمان، تەنیا بە شێوەیەکی ناروون یا رواڵــەتی دەمــانتوانی پــەی بــە شتەکان ببیەین. ئێمە پێشتر ئاماژەمان بە بۆچوونی **هامبۆڵت** کرد، لــە ســەر ئــەم بنەمایــە کــە (*مــرۆڤ بــە گشــتی لەگــەڵ بابەتــەکان دەژی، تەنانــەت رەفتــار و هەستەکانی پەیوەندی بە بۆچوون و وێناکردنەکانییەوە هەیە و، مرۆڤ بوونەوەرێکی تایبەتە، کە زمان رەفتار و هەستەکان بۆ ئەو یا لەوەوە دەگوێزێتــەوە هـ س ل٧٤*). لە ژێر کاریگەری رێژەگەرایی نوێی رۆمانتیکەکان، چەمکی زمــان وەك ئامرازێـك بۆ بیرکردنەوە گۆڕانێکی گرینگی بەسەر داهاتووە، ئەم بڕوایەش کە زمــان دەبێتــە هۆی جیاکاری و تەنانەت نایەکسانی پرۆسە زەینییەکان، تــاوتوێ کــراوە[١]، بــەڵام ئەم دەرئەنجامانە پەیوەندیان بە بابەتــە ســەرەکییەکەوە نییــە. ئێمــە لەگــەڵ ئــەم دەرئەنجامانە دا نوێین و من لێرەدا باسیان ناکەم.

---

کەواتە تواناکان شتێکی ترن جگە لەم ئەم ئۆرگانە. ئاشکرایە کە **نــەفس**، ئــامێرێکی ڕووناکبینــە). (**نــەفس** وشەیەکی بێ ناوەرۆکە و هیچ کەس هیچ شتێك لە بارەیدا نازانێ و تاك و تەنیا بۆ دیاری کردنی ئــەو بەشــەی خۆی، کە بیردەکاتەوە بــەکاری دێنــێ. ل١٢٨). نــاوبراو بــە لەبەرچــاوگرتنی خــەیاڵکردنی مێشــکی مــرۆڤ، راشکاوەانە قبوڵی دەکا کە (چییەتی مێشك و ئەرکەکانی لامان شاراوەیە) و بەرهەمــەکانی (دەرئــەنجامێکی سەرسوڕهێنەر و پەی نەبردنە بە پێکهاتەکەی. ل١٠٧). نووسەرانی دواتر، بەم چڕوپڕییە لەم بابەتە نــەدواون و بیرکردنەوەیان بە چۆڕاوگەی مێشك زانیوە. هەروەك ئەوەی چۆن جگەر رژێنی سەفرا دەردەکا.

[١]- پەیڕەوانی دیکارت، وەك ئاسایی، گریمانەیان دەکرد، کە پرۆسە زەینییەکان، لە تێکڕای مرۆڤە ســادەکاندا یەکسانە و، زمانەکان تەنیا لە شێوەی دەربڕینی بیرکردنەوە و لە رووی خودی بیرکردنەوە، پێویستە جیاوازیــان هەبێ. بۆ نموونە **کۆردۆموا** لە باسی فیربوونی زماندا (هـ س ل٤٠ بەدواوە)، فیربوونی **زمانی دووەم**، بە تەواوی بە گەیاندنی نوێی ئەو بیرکردنەوانە دەزانێ، کە تائێستا بە **زمانی یەکەم** ئەدا دەکران. کەواتە ئاکامەکە ئەمە دەبێ: وەرگێڕان لە زمانیکەوە بۆ زمانێکی تر، نابێ گرفتی بنەڕەتی بێتە بەردەم. رومانتیستەکان بە زەحمــەت ئەم بانگەشەیان رەت دەکردەوە، چونکە زمان نەك هەر ئاوێنەی زەینە، بەڵکو بە توخمی سەرەکی پرۆســەکانی زەین و بە رەنگدانەوەی تاکگەرایی فەرهەنگی دەزانن.

# ژێرساز و رووساز

بینیمان لایــەنی داهێنەرانــەی کــەڵك وەرگــرتن لــە زمــان، پشــت بــەم گریمانەیــە دەبەستێ، کە پرۆســە زەینــی و زمانییــەکان هاوشــێوەن یــا وەك یــەکن و، زمــان دابینکــەری ئــامرازە ســەرەتاییەکانە بــۆ دەربڕینــی بیروبیۆچــوون و هەســتەکان، هەروەها بۆ خەیاڵی داهێنەرانە. بەم پێیە زۆربەی ئەو باسە سەرەکییانەی دەربارەی دەستوور، بە درێژایی ئەو گەشە کردنەی ئێمە ناومان نــاوە **زمانناســی دیکــارتی،** رەگ و ریشــەیان لــەم گریمانەیــەدا هەیــە. بۆنموونــە **دەســتووری پــۆرت رۆیــاڵ،** دەستوورێکە بەم گریمانەیە دەسپێدەکات کە (زەین سێ جــۆر کــردەی هەیــە: پــەی پێبردن، بەڵگەمەندی، ئاقڵمەندیدی. ل ٢٧)، کە دیــارە ســێهەمیان پەیوەنــدی بــە دەستوورەوە نییە. (ئەم بابەتە لە کتێبی **لۆجیکی پۆرت رۆیاڵ** وەرگیراوە، کــە دوو ساڵ دواتر لە ساڵی **١٦٦٢** بڵاوکرایەوە). **دەستووری پۆرت رۆیاڵ** لە سەر بنــەمای ئەو میتۆدە کە چەمکەکان لە زانیارییە دەسکەوتووەکاندا پێکــەوە ئاوێتــە دەبــن، شکلی گشتی و شیاوی دەستووری لێدەکەوێتەوە، دواتر ئەم پێکهاتەی ژێربینــایی سروشتی لە سەر بنەمای (رەفتاری سروشتی کە بیرو هزری خۆمانی پێ دەردەبڕین. ل٣٠)[١] شرۆڤە دەکات. زۆربەی هەوڵەکانی دواتــر، بــۆ بەدەســتەوەدانی نموونەیــەك لەمەڕ **دەستووری هاوبەشی گشتی،** هەر لەسەر ئەم تەوەرانە وەستاوە.

کتێبی **هۆرمز** لە نووسینی **جیمیز هــاریس،** کــە وێناچــی وەك کارەکــانی تــری سەدەی هەژدەهەم، لــە ژێــر کاریگــەری دەســتووری پــۆرت رۆیــاڵ دابــووبێ ، بــە رێبازێکی جیاواز، پێکهاتەی زمان لە پێکهاتەی پرۆســە زەینییــەکان هەڵــدێنجێ. هاریس بە گشتی دەڵێ ، کاتیك کەسێك دەدوێ (وتە یا گوتارەکەی جۆرێکی هێــز

---

[١]- ئێمە راستەوخۆ دەگەڕێنەوە سەر هێندێك لە پێشنیارە بابەتییەکانی.

یا بزاوت لە روحییەوە پەخش دەكاتەوە. ل٢٢٣). **هێــزە روحییــەكان**[١] دوو جــۆرن: **پەی پێبردن** (وەك هەست و زەین) و **ئیرادە** (وەك ئارەزوو، شادی، حەز - هەرچــی دەبێتە كار (فەرمان) دەیگرێتــەوە چ **لــۆجیكی** چ **نــالۆجیكی**. ل٢٢٤) [٢]. كەواتــە دووجۆر كردەی زمانی هەیە: (**رواڵەتی** واتە بڵاوكردنەوەی جــۆری وەرگــیراو، چ لــە رێگەی هەستەكانەوە چ لە رێگەی زەینەوە)، **بڵاوكردنەوەی ئیرادە**[٣] وەك، پرســیار، فەرمان، نزا یا ئارەزوو. ل٢٢٤). رســتەكانی **جــۆری یەكــەم** بــۆ دەربڕینــی دۆخ و هەواڵی خۆمان بۆ كەســانی تــر، بــەكار دەبــرێ و، رســتەكانی **جــۆری دووەم**، بــۆ هاندانی كەسانی تر بۆ دەستەبەر كردنــی نیازەكانمــان. بــەم پێیــە دەتــوانین رســتە ئیرادییەكان لەسەر ئەم بنەمایە شیبكەینەوە، كە ئایــا نیــازی ئێمــە ئەمەیــە كــە (*پــەی پێبردنێــك هــەبێت*) یــا (*یــا ئارەزویــەك بێتــە دی*) (*حاڵەتــەكانی پرســین و داخوازی*). دەكرێ حاڵەتی داخوازی بە دوو جۆر دابنێین: **فــەرمانی** یــا **پاڕانــەوە** و ئەمەش پەیوەستە بەوەی كە رستەكە ئاڕاستەی وتەگری (**مخاطب**) ژێــر **دەســتە** یــا

---

[١]- powers of the soul

[٢]- كەواتە ئاكامەكەی ئەوە دەبێ، كە رستە پرسیاری و هەواڵییەكان (كە وەڵامی رستەی پرسیاری دەدەنــەوە) بە تەواوی پێكەوە بەستراونەتەوە (ئەم لێكنزیكییە بە جۆرێكە كە كارەكان (افعال) لــەم دوو رووە شــێوەیەكی نەگۆڕ دەپارێزن و لێكجیا ناكرێنەوە، مەگەر بە زیاد كردن یا لابردنی پیتێكی گچكە، یا بە گۆڕانێكی كەم لە پێكەوە گونجاندی وشەكان، یا تەنانەت بە گۆڕینی ئاواز یا پشتیوانەی دەنگ. ل٢٩٩). بە دەربڕینێكی وردتر، لەمەڕ رستەی پرسیاری سادە (واتە ئەو رستە پرسیارییانەی وەڵامەكەیان بەڵێ یا نەخێرە) وەڵامدانەوە (جگــە لە حاڵەتی لابردن) نەبێ، تارادەیەك بە هەمان ئەو وشانە دەدرێتەوە كە لە پرسیارەكەدا بــەكار هــاتوون. لــەم حاڵەتەدا دەتوانین (رستەگەلی پرسیاری نادیار)، بە ژمارەیەكی بێ سنوور رســتەی ئــەرێنی یــا نــەرێنی وەڵام بدەینەوە. بۆ نموونە لە وەڵامی (ئەم هۆنراوانە هی كێن؟) دەتوانین رستەگەلی ئەرێنی وەڵام بدەینەوە وەك (هی ویرجیلن) (هی **هۆراس**)، (هی **ئۆڤیدن**)، یا رستەگەلی نەرێنی (هی **ڤیرجیل** نییە)، (هی **هۆراس** نییە)، (هی ئۆڤید نییە)، كە هەرچۆنێك بێ ژمارەی ئەم رستانە بێ سنوورە. ل٣٣٠ پەراوێز).

[٣]- publish volitions

**بالادەستە.** هەردوو جۆری رستەکە، پرسین یا داخوازی **بۆ گەیشتن بە نیاز**[1] بەکار دێن و، هەردووکیشیان **پێویستیان بە وەڵامە**، وەڵامێك بە شێوەی کرداری یا زمانی بۆ داخوازی، وەڵامێك بە شێوەی زمانی بۆ پرسین (ل **٢٩٣** و دواتر)[2]. بەم پێیە چوارچێوەی شیکردنەوەی جۆرەکانی رستە، پەیوەستە بە شیکردنەوەی تایبەتی پرۆسە زەینییەکان.

لە زمانناسی دیکارتی دا، بۆ جیاکردنەوەی **جەستە** و **زەین**، گریمانەی ئەوە کراوە کە زمان دوو لایەنی هەیە. دەتوانین هێما زمانییەکان لە روانگەی دەنگە پێکهێنەرەکانیانەوە تاوتوێ بکەین، یا لە روانگەی ئەو نیشانانەی کە نوێنەری ئەو هێمایانەی سەرەوەن. هەروەها دەتوانین ئەوانە لە روانگەی (*ئەو میتۆدەی مرۆڤەکان بۆ دەربڕینی بیر و هزری خۆیان بەکاری دێنن. دەستووری زمانی هاوبەشی گشتی و ئەقڵانی. ل٥*). کۆردۆمواش مەبەستەکەی بە چەند گوزارەی هاوشێوە راڤە دەکات (بڕوانە هـ. س ، پێشەکی): (*من جیاوازی دادەنێم لە نێوان ئەو لێکدانەوەیەی کە وتە لە رووحەوە سەردەردێنێ و لە جەستەوە دێتە دەرێ*).

**لامی**ش وتارەکە بە جیاوازی نێوان **روحی وتە** و **جەستەکانیان**، دەسپێدەکات. **روحی وتە** ( *واتە ئەو شتانەی خاوەن مەعنەویاتن و ئەوەی تایبەت بە ئێمەی مرۆڤە- توانایی دەربڕینی بیروراکان*) و، **جەستەکانیان** (*ئەوەی کە وتە لە ناو گوتراوە مادییەکاندا لەبەر دەستی دایە*).

---

[1]- to answer to a need

[2]- **پەی پێبردن** فارسیەکەی **ادراك** ە کە بە پێی رستە بە مانای زانین و تێگەیشتن و حاڵی بوون... دێت. ئیرادە بەمانی ویست کە هەموو حەز و ئارەزوو و داخوازییەکان دەگرێتەوە، لە هێندێك شوێن بە مانای تواناش دێت. و/ کوردی.

به کورتی زمان خاوەنی دوو لایەنی **دەروونی** و **دەرەکییە**. دەتوانین رستەیەك لە رووی چۆنییەتی دەربڕینی بیرۆکەیەك، لە رووی شێوەی فیزیکییەوە تاوتوێ بکەین، واتە لە روانگەی نواندنی **دەنگسازی** یا رەنگدانەوەی مانایی.

ئەگەر بمانەوێ زاراوەکانی ئەمرۆکە بەکاربێنین، دەتوانین بڵێین، جیاوازی لە نێوان **ژێرسازی** رستە و **رووسازی**[1] رستەدا هەیە. **ژێرساز**، پێکهاتەیەکی ئەبستراکت و بنەڕەتییە کە رەنگدانەوەی مانای دەدات بە دەستەوە. **رووساز** رواڵەتی ئەو یەکانەیە کە رەنگدانەوەی دەنگسازی رستە دیاری دەکەن و پەیوەندی هەیە بە شێوەی فیزیکی وتەوە، یا ئەو شێوەی پەی پێدەبەین یا لەبەرچاومان گرتووە. دەتوانین خاڵێکی تر لە زمانناسی دیکارتی هەڵێنجین، ئەویش ئەمەیە، کە **ژێرساز** و **رووساز** یەکسان نین یا نابێ یەکسان بن. واتە پێکهاتەی ژێرەوەی رستەکە پەیوەندی بە رەنگدانەوەی واتایی رستەیە، مەرج نییە یا نابێ بە هەمان نەزم و پێکهاتەی رواڵەتی توخمەکانی دەرکەوێ.

دەستووری **پۆرت رۆیاڵ** ئەم خاڵەی بە روونی باس کردووە. لەم کتێبەدا بۆ یەکەمین جار، روانەگەیەك بۆ زمان هەڵدەبژێردرێ، کە لەسەر راو بۆچوونەکانی **دیکارت** دامەزراوە و، بەرچاوروونی و وردبینیی بەرچاوی تێدا بەدی دەکرێ[2]. شێوەی

---

[1]- دەکرێ لە بری deep stracture، ژێرساز، ژێر پێکهاتە، ژێرخان، بنساز و... هیتر، هەروەها لە بری surface stractur، دەکرێ رووساز، سەرساز، روو پێکهاتە، سەرپێکهاتە،... بەکار بێنین، وەلێ هێشتا زمانەوانان لە سەر هیچکامیان ساغ نەبوونەتەوە، بۆیە منیش بۆ ئاسانی تێگەیشتن و بڕوا بە کورتی وبە لەباری زاراوەکە، بەکارم هێناوە.

[2]- دەتوانین شوێنی **تیوری پۆرت رۆیاڵ**، جگە لە شوێنە دیکارتییەکەی لەمەڕ جیاوازی نیوان **ژێرساز** و **رووساز**، لە دەستووری سەردەمی **سکۆلاستیك** و **رێنسانس** و، بە تایبەتی لە **تیوری لابردن** و**جۆرەکانی ئیدیال**

سەرەکی بیرکردنەوە (بەڵام نەك تەنیا شێوەکەی - بڕوانە ل٨٩،٨٨،٨٧ ی ئەم کتێبە) دەسکەوتێکە کە لەسەر بنەمای ئەو دەسکەوتە، لایەنێکی تر پەسند دەکرێ. دەربڕینی زمانیی ئەو بە شێوەی گوزارەیە و ئەو دو زاراوەی بۆی بە کارهاتووە بریتین لە (**بکەر** *مانای کەسێك یا شتێك کە لەبارەیەوە شتێك دەخەینە روو*(*پشتیوانە*[1] *مانای ئەوەی دەریدەبڕین. ل٢٩*). بکەر و اسناد یا **سادەن** وەك (*زەوی خڕە*) یا **ئاوێتەن** وەك رستەی (*حاکمێکی بە توانا کەسێکی بەکەڵکە بۆ کۆمار*) یا (*خواوەندی نادیار جیهانی دیاری خوڵقاند*). سەرەڕای ئەمە لەبارەی بکەر و پشتیوانەی ئاوێتە:

**لانیکەم لە زەینی ئێمەدا لێکدانەوەی زۆر هەیە و دەتوانین بەو ئەندازەیە رستە دروست بکەین. وەك چۆن کاتێك دەڵێین (خواوەندی نادیار جیهانی دیاری خوڵقاند) سێ دانە لێکدانەوە لە زەیندا وەدی دێن، کە لەم رستانەدا دەگونجێنرێن، لەبەر ئەوە من لەو رستەی سەرەوە ئەمانە هەڵدێنجم: ١- خواوەند نادیارە، ٢- ئەو جیهانی خوڵقاند، ٣- جیهان ئاشکرایە. لەم سێ رستەیە، دووەمیان رستەی بنەڕەتی و سەرەکییە و رستەی یەکەم و سێهەم تەنیا گوزارەی لاوەکین و بەشێکن لە رستەی بنەڕەتی. رستەی یەکەم بکەر و رستەی دووەم پشتیوانەی رستەی بنەڕەتی پێکدێنێ (ل٦٨).**

بە واتایەکی تر ژێرساز، گوزارەی (*خواوەندی نادیار جێهانی دیاری خوڵقاند*)، سێ دەستەواژە جیا دەگرێتەوە، کە هەر کامێکیان بە شێوەیەك هەڵێنجراون، هەرچەندە شکڵی روزسازی دەستە واژەکە تەنیا پێکهاتەی پشتیوانەییە (**اسنادی**) یە.

---

لە کتێبی **مینروا** (١٥٨٧) نووسنی **سانتیکوس** دا بدۆزینەوە، کە بە ترۆپکی خۆی گەیشتبوو. بۆ بەدواداچوونی پتر بڕوانە (ساهلین ه.س. بەشی ١ ل٨٩ بەدواوە).

[1] - predicate

ئاشکرایە ئەم ژێرسازە زارەکییە، واتە یەکالاّ ناکرێتەوە، بەلّکو تەنیا لە زەیندا خۆی دەنوێنیّ:
**بەم پێیە ئەم دەستەواژە لاوەکییانە بیّ ئەوەی لە گوتار دا بەرجەستە بن، لە زەینمادا هەن، وەك نموونەکەی سەرەوە (خواوەندی نادیار، جیهانی دیاری خولّقاند. ل٦٨)**

هێندێك کات دەتوانین ژێرساز بە شێوەیەکی روونتر نیشان بدەین، ئەگەر بێتو نموونەکەی سەرەوە بەم دەنگانە دەربڕین: ئەو خوایەی کە نادیارە، جیهانێکی خولّقاند کە دیارە. ل٦٨و ٦٩). بەلاّم ئەم رستەیە دیفاکتۆی بونیادی زەینی پێکدێنیّ، جۆرێك هاوڕێیی زەینی لەگەلّ گوتار - بە بیّ ئەوەی گویّ بدرێتە ئەوەی کە ئایا ئەم شێوە رووسازەی گوتە کە بەم شێوەیە بەرهەم دیّ، بە شێوەی سادە و بەش بەش لەگەلّ ئەودا هاووێنەیە یا نەخێر؟
بە گشتی پێکهاتەکانی **ناو** وێڕای ناوێکی تر لە رۆلّی ئاوەلّناوی بەرکاری یائاوەلّناو، ژێرسازی خاوەن بەندی پەیوەستن: (تێکڕای ئەم شێوەی پەیوەندییە لە چەمکی خۆیدا گونجاندووە ودەتوانیّ بە هۆی ئامرازی پەیوەندی دیاری بکریّ. ل ٦٩). ژێرسازی یەکسان لە زمانگەلی جیاوازدا رەنگە رووسازی جیاوازی هەبیّ، وەك ئەم دەستەواژە لاتینییە: vido canem currentem واتە من سەگێك دەبینم رادەکا) کە بە فەرەنسی بەم شێوەی دەردەبڕدریّ vois un chien qui court) ل٦٩-٧٠) شوێنی راناوی **پەیوەندی** لە **گوزارەی زارەکیدا** بە رێسایەك دیاری دەکریّ، کە ژێرساز دەگۆڕیّ بۆ رووساز. بۆ نموونە دەتوانین ئەم بابەتە لە گوزارەی (ئەو خوایەی کە من دەیپەرستم) و (ئەو خوایەی کە بە دەستی ئەو جیهان خولّقێنرا) داببینین. لەم بارەوە:

**ئامرازی پەیوەندی هەمیشە لە سەرەتای دەسەواژەکەدایە، (لەگەل ئەوەشدا لەسەر بنەمای مانا، جگەلە کۆتایی رستە نابێ لەهیچ شوێنێکی تر بێت) مەگەر لە ژێر دەسەلاتی ئامرازی پەیوەندی (پریپۆزیشن) دابێت (کە لەم حالەتەدا) هەرچۆنێك بێ پیتی پەیوەندی دەکەوێتە پێش ئامرازی پەیوەندی. ل٧١**

لەم رستانەی دواییدا ژ**ێرساز**، خاوەنی سیستمێکی دەستەواژەکانە، کە لە گوزارەی گوتراودا راستەوخۆ و یەك بە یەك دەرناکەون. ئێمە بۆ دروستکردنی رستەیەکی واقعی، رێسایەکی دیاری کراو لەم سیستمە بنەڕەتییەی گوزارەکانی سەرتایی، هەلدەگرین (*ئێستا بەم یاسایانە دەلێین **رێزمانی گوێزانەوە***[1]). لەم نموونانەدا ئێمە ریسایەك بە کاردێنین، کە ئەو راناوە پەیوەندییەی جێگای ناوی گرتۆتەوە کە لە دەستەو واژە شاراوەکەدا، بەرزی دەکەینەوە (*لەگەل ئەو گوزارەی پێش ئەم دێ*)، دوای ئەوە دەتوانین بە دلی خۆمان راناوی پەیوەندی لابەرین و هاوکات کاری پەیوەندی یش وەلانێین (*وەك خواوەندی نادیار*)، شێوەی کارەکە بگۆڕین وەك (canis currens سەگەکە رادەکا). لە کۆتاییدا لە هێندیك حالەتدا جێگای ناو ئاوەلناو دەگۆڕدری (un habile magistrate).

گوایە، ئەو **ژێرسازەی** مانا دەخولقێنێ، لە هەموو زمانەکاندا یەکسانە، چونکە رەنگدانەوەی سادەی شێوەکانی بیرکردنەوەیە. ریساکانی گەردان کردن کە **ژێرساز** دەگۆڕن بۆ **رووساز**، لە زمانی جۆراوجۆردا جیاوازن. ئەو رووسازەی لەم گەردانکردنە وەدەست دێ، جگە لەو حالەتە زۆر سادەیەدا، پەیوەندی مانایی زاراوەکان راستەوخۆ نیشان نادات. ژێرسازی **گوتەزای واقعی**[2]، کە

---

[1] - grammatical transformations

[2] - actual utterance

دروستکردنەکەی بە تەواوی ئەبستڕاکتە، ناوەرۆکی مانای رستە دەرنابڕێ. لەگەڵ ئەمەشدا ئەم ژێرسازە پەیوەندی بە رستە واقعییەکانەوە هەیە، لەبەر ئەوەی هەرکامێك لەم گوزارە ئەبستڕاکتانەی ئەو رستەیە پێك دێنن (*لەو حاڵەتانەی لەسەرەوە باسکرا*)، دەتوانێ راستەوخۆ لە شێوەی دەرهاویشتەی گوزارەیی سادە دەرکەوێ.

کتێبی **لۆجیکی پۆرت رۆیاڵ** بە دوور و درێژی لە تیوری گوزارە بنەرەتی و لاوەییەکان دواوە، وەك توخمەکانی پێکهێنەری ژێرساز، لەگەڵ شێکردنەوەیەکی درێژی گیرەك لێکنراوەکان. لەوێدا جیاوازیان لە نێوان گیرەکە لێکنراوەکانی روون کردنەوە و دیاریکردن، داناوە. ئەم جیاوازییە، لەسەر بنەمای شیکردنەووەی پێشووی پەی **پێبردن** و **واتاو** و **چەمکە هاوبەشە گشتییەکان**[١] وەستاوە، کە ئیستا

---

١- universal ideas.

چەمکی **ئیدە** (idia) لە بیرکردنەوەی دیکارتیدا گرینگە وەلێ قورسە. لە نووسینەکانی **دیکارت** دا کەڵك لە زۆر زاراوەی وەرگیراوە، وەك **ئیدە** یا **چەمك**، بەلام جیاوازییەکی ئەوتۆیان لە نێوان دانەنراوە و خودی چەمکیش روون نییە. دیکارت زاراوەی **ئیدە** دەبەستێتەوە بە **شێوەی خەیاڵی و** دەڵێ: (هەندێك لە بیرو هزرەکانی من، ئەگەر زیادەرەوی نەبێت، شێوەی خەیاڵی شتەکانن و، بەکارهێنانی زاراوەی ئیدیا تەنیا بۆ ئەوانە راستە.) (Medetations, III, translated by Haldane & Ross, vol. 1, p. 56)

دیارە ئەو **وێنە خەیاڵیانە** رەنگە بەرهەمی هێزی خەیاڵ، یا لێکدانەوەی دەروونی بن، نەك وەك ئەو شتەی لە رێگەی هەستەکانەوە دەستەبەر دەکرێ. مەبەستەکەم روون دەکەمەوە. ناوبراو لەوەلامی نارەزایەتی **هابز،** بەم نووسینە مەبەستی خۆی رون دەکاتەوە (وێدەچێ هێندێکی گۆڕیبێ) و دەڵێ: مەبەستی من لە زاراوەی **ئیدە**، هەر ئەوەیە کە زەین راستەوخۆ پەی پێدەبا. کەواتە کاتێك من دەمەوێ و یا دەترسم، هاوکات پەی بەوە دەبەم کە دەترسم و هەم دەمەوێ و پەی پێدەبەم، کە تێکڕای ئیرادەو پەی پێبردنەکان بەشێکن لە ئیدەکانی من. (Haldane & Ross, vol. II, PP. 67-68)

وێدەچێ کەڵك وەرگرتنی دواتر لە زاراوەی ئیدە، لە ئاستی بیرکردنەوە لەگەڵ کەڵك لێوەرگرتنی گشتی لەم زاراوەیە، هاوئاهەنگ بێ. بۆ نموونە، ئەو لە کتێبی **وتە لە میتۆددا** لە (هێندێك لەو یاسایانەی، کە خواوەند

پێیان دەوترێ **مانا** و**سەرچاوە**[1]. تێگەیشتن لە چەمکێك، کۆمەڵێك خەسڵەتی زاتین کە ئەو چەمکە روون دەکەنەوە، وێرای هەرچی بکرێ لێ هەڵبێنجرێ و **تێگە**[2]، کۆمەڵە شتێکە کە خۆی دەلالەتیان لێدەکات:

---

لە سروشتی هاویشتووە و، لەوانەوە چەندان ئیدەی لە زەینی ئێمەدا تۆمار کردووە) دەدوێ ٠هـ. س. ل١٠٦).
بەم پێیە لە کتێبی **بنەماکانی فەلسەفە** دا (هـ. س ل٢٢٤) جیاوازییەکی دیاری کراو، دانەنراوە لە نێوان ئیدەی **ژمارە** و **شێوە** و هێندێك چەمکی ئاسایی تر وەك: ئەگەر بۆ هەردووبەری هاوکێشەیەك بڕێکی نەگۆڕ زیاد بکرێ ئاکامەکەی هەر یەکسانبوونی هەردوو بەری هاوکێشەکەیە، وە نموونەی تر. زاراوەی **ئیدە** لەو ئاستەی هەرشتێك پەی پێببرێ نەك تەنیا خەیاڵ بکرێ، لە لۆجیکی پۆرت رۆیاڵیش دا کەڵکی لێوەرگیراوە. بەم پێیە جۆرەها شێوە چەمکی و تەنانەت گوزارە، ئیدەن. (کە لە کوردی دا دەبێتە بیرۆکە و/ك). ئەم کاراییە، زۆر باوە. لامی (هـ. س. ل٧) ئیدە بە موڵکی زەینی دەزانێ و دەڵێ:
سەرەڕای ئەو وێنا و بیرۆکانەی لە ئارادان، بە هۆی ئەو شتەی کار دەکاتە سەر جەستەی ئێمە، سەر هەڵدەدەن، ئیدەگەلی تر لە سروشتمان دا دەدۆزینەوە، کە هەرگیز لە رێگەی هەستەکانمانەوە نایەنە ناو زەینمان، وەك ئەوەی چەند ئیدەیەکن راستییە بنەڕەتییکانمان نیشان دەدەن، ئەو راستییانەی وەك: پێویستە هەرشتێك موڵکی هەرکەسێکە بۆ خاوەنەکەی بگەڕێنرێتەوە، یا مەحاڵە **شتێك** لەیەك کاتدا **هەبێ** و **نەبێ**.
بەگشتی، گوزارە سادەو ئاوێتەکانی دەستووری لۆجیکی پۆرت رۆیاڵیش، ئەم چەمکەی ئیدەی لەبەر چاوگرتووە، چونکە گوزارە پێکهاتەییەکانی بە بنەمای گوزارەکان داناوە، بەو مانایەی کە **ئیدە** گوزارشتێکی فۆنێتیکییە لە تیورییەکانی زەینی. پەی پێبردن یا **ئیدراك** (واتە مەبەست، یامانا) ی یەك ئیدە لە روون کردنەوەی ماناییدا چەمکێکی سەرەکییە و، ئەگەر ژێرسازی زمان، بە رەنگدانەوەی راستەوخۆی پرۆسە زەینییەکان بزانیین، ئەو کاتە **ئیدە** لە شیکاری بیرکردنەوەدا دەگۆڕێ بۆ **چەمکێکی سەرەکی**. بۆ بە دواداچوونی پتر بڕوانە یاداشتی ٢ لە لاپەڕەی ٢٧٦ تا ٢٨٥ لەم کتێبەی خوارەوە:
J. Veitch, The Method, Meditations, and Selections from the Principles of Descartes, Edinburgh, Blackwood 7 Sons (1880)

[1]- reference، ئەو سەرچاوەی وشکەی لێوەهاتووە یا پەیوەندی سینتاکسی پێیەوە هەیە. و/کوردی.

[2]- وشەی (sense, intension,refrence،extension) مانا، واتا، چەمك، تێگە، هەروەها واتا، دەگەیەنێ: کە هەر زاراوە بەپێی شوێنی تایبەتی خۆی لە رستەدا بەکارهاتووە. و/ کوردی.

**پەی بردن بە چەمکێك مانای تێگەیشتنە لە بەشە پێکهێنەرەکانی، ناتوانین هیچ کام لەو بەشانە لەو چەمکە جیا بکەینەوە، مەگەر چەمکەکە لەناوبەرین. بۆ نموونە چەمکی سێ گۆشە پێکهاتووە لە چەمکی سێ لا و چەمکی سێ زاویە و چەمکی یەکسانی کۆی گۆشەکان بە دو ئەوەندەی گۆشەی راست و هیتر.**

**واتای چەمکێك، کۆمەڵە شتێکە کە دەتوانین زاراوەی دەربڕی ئەو چەمکەیان لەسەردا دابنێین. ئەوشتانەی پەیوەندیان بە واتای چەمکەکەوە هەیە، ژێرچەمکی ئەو چەمکەن و خودی ئەو چەمکە بە بەراورد لەگەڵ ئەو شتانە سەرچەمك ی پێدەوترێ. کەواتە واتای چەمکی گشتی سێ گۆشە، هەموو بەش و لایەنەکانی سێ گۆشە دەگرێتەوە. (ل٥١)**

لەسەر بنەمای ئەم بۆچوونانە، دەتوانین جیاوازی دابنێین لە نێوان ئەم رستانەی روونکردنەوەن وەك: (*پاریس کە گەورەترین شاری ئەوروپایە*) و (*ئەو مرۆڤ کە لەناودەچێ*) لەگەڵ **گوزارەی دیاری کەر** وەك (*ئەنە شەفافەکان و مرۆڤی ئیماندار، یا ئەو تەنانەی کە شەفافن و ئەو مرۆڤەی کە ئیمانداره*. ل٥٩ و ٦٠ و ل١٨).

**گوزارەی ئاوێتە ئەوکاتە گۆزارەی لێکدانەوەییە، کە ١- واتای دەربڕاو لە چەمکی گوزارەی سەرەکی دا هەبێت، ٢- واتای دەربڕاو لە گوزارەی ئاوێتەدا، واتای تایبەتی لاوەکی هەموو ژێرچەمکەکانی ئەو چەمکە بێت کە زاراوەی سەرەکی ددەیگەیەنێ. ل٥٩-٦٠).**

**گورزارەیەکی ئاوێتە کاتێك بە دیارکەر دەزانن کە ئەو مصداقانەی بەهۆی گوزارەی ئاوێتە دەربڕدراون، کەمتر بێ لە واتاکانی زاراوە سەرەکییەکان. ل٦٠)**

لە **بەندی وابەستەی لێکدانەوەیی**[1] دا، ئەگەر سەرچاوەکە راناوی پەیوەندی جێگرەوەی راناو بێ، ژێرسازی بەندەکە تەواو مانای دەرهاویشتەی هەیە، کە لەو

---

١- explicative relative clause

بەندەدا خراوەتە روو. بۆنموونە رستەی (*ئەو مرۆڤانەی خولّقێنراون تا خوا بناسـن و خۆشیان بوێ*)، ئەمە واتایەكی ناوەكی هەیە، كە مرۆڤ بـۆ ناسـین و خۆشویسـتنی خوا خولّقێنراوە. كەواتە **بەندی وابەستەی لێكدانەوەیی**، تایبەتمەندی سەرەكی پیتی پەیوەندی هەیە. وەلێ لەبارەی بەندی وابەستەی دیاركـەری ئـەم بابەتـەدا، راسـت نییە. كەواتە كاتێك دەلّێین (*ئەو پیاوانەی لەخواترسن، خێرخوازیشـن*) مەبەسـتمان ئەوە نییە كە مرۆڤەكان لـە خواترسـن و هـەروەها مرۆڤـەكان خێرخوازیشـن. لـە دەسپێكی ئەم گوزارەیەدا،

**ئێمە چەمكێكی ئاوێتە بە لەپالّ یەك دانانی دوو چەمكی سادە دروست دەكەین (چـەمكی مرۆو چەمكی لە خواترس) و ئاوای لێكدەدەینەوە كە تایبەتمەندی خێرخوازبوون، بەشێكە لەم چەمكە ئاوێتەیە. لەسەر ئەم بنەمایە، بەندی وابەستە، شتێكی لەوە پتر نالّێ، كە چەمكی لە خواترسی لەگەلّ چەمكی مرۆڤدا نایەت. كەواتە لەم لێكدانەوەیـە بۆمـان دەردەكـەوێ كـە دەتوانین چ واتایەك لە چەمكی ئاوێتەی مرۆڤی لەخواترس هەلّێنجین. (ل١١٩)**

هەروەها سەرنج بدە ئەم گوزارەیە (*ئەو بڕوایەی كە باشی رەها بـە چـێژی هەسـتی جەستە دادەنێ و بە هۆی **ئەبیكۆرە**و بلاّوكرایەوە، لە ئاستی فەیلەسوف دا نییـە*)[١] بكەری ئەم رستەیە بریتییە لە (*كە باشی رەها بە چێژی هەستی جەستە دادەنێ*) و بەندی وابەسـتەی لێكدانـەوەیی بریتیـە لە(بـە هـۆی ئـەبیكۆڕەوە بلاّوكرایـەوە).

---

[١]- لە دەقە فەرەنسییەكەدا، رستە راستەقینەكە ئاوایە:

La doctorine qui met le souverain bien dans la volupte du corps, laquelle a ete enseignee par Epicure, est indigne d un philosophy.

لە وەرگێراوەكەی دیكاف و جیمز كە من لە شوێنێكی تر بینیومە، ئاوا نووسراوە:

The doctorine which identifies the sovereign good with sensual pleasure of the body, and which was taught by epicurus is unworthy of philosopher.

دەلالەت[١] راناوی پەیوەندی بەندی یەکەم لە گوزارەی ئاوێتەی (*ئەو بڕوایەی کە باشی ڕەها لە چێژی هەستی جەستەوە دەزانێ*) دایە. لەوێوە کە (*بە هۆی ئەبیکۆڕەوە بڵاوکرایەوە*) لێکدانەوەییە، ڕستەی سەرەتایی، ئەم تێگەشتنە ناوەکییەی هەیە، ئەو بڕوایەی کەوتۆتە بەر باس، ئەبیکۆڕ بانگەشەی بۆ کردووە. بەڵام راناوی پەیوەندی وابەستە ناتوانین لەگەڵ دەلالەت لێکراوەکە جێگۆڕ بکەین تا ناوەڕۆکی هەموو ڕستەکە بگەیەنێ. لێرەشدا گوزراەی ئاوێتە کە بەندی وابەستەی دیارکەر و **سەرچاوەکەی** دەگرێتەوە، چەمکێکی ئاوێتە دروست دەکەن، کە پێکهاتووە لە هەردوو چەمکی بڕوا و، وەك یەك دانانی **باشی ڕەها**[٢] لەگەڵ **چێژی هەستی**[٣] جەستە. لەسەر بنەمای ئەم تیۆرییەی پۆرت ڕۆیاڵ تێکڕای ئەم زانیارییانە دەبێ لە ژێرسازدا بوونیان هەبێ و لێکدانەوەی مانایی ئەم ڕستەیە، بەکەڵك وەرگرتن لەم زانیارییانە، دەبێ هەر وەك ئەوە بێ کە باسکرا. (ل١١٩ و ١٢٠)

هەر لەسەر **تیوری پۆرت ڕۆیاڵ** بەندی وابەستەی دیارکەر، لەسەر بنەمای یەك گوزارە وەستاوە، تەنانەت ئەگەر ئەم گوزارەیە، کاتێك بەندی وابەستە لە گوزراەیەکی ئاوێتەدا بەکار دەبرێ، پەسندیش نەکرێ. ئەوەی کە لە گوزارەی (*مرۆڤانێك لە خواترسن*) جێگای پەسندە، لە گونجانی چەمکە پێکهێنەرەکانی بەولاوە شتێکی تر نییە. لەبەر ئەوە لە گوزارەی (*ئەو زەینانەی چوارگۆشەن،*

---

[١]- دەلالەت، یا سەرچاوە= reference بریتییە لەو بەشەی مانای گروپێکی ناوی کە بە شتێکییەوە دەبەستێتەوە، ئەوبەشەی مانای هەواڵیی کە دەیبەستێتەوە بە بەهایەکی ڕاست، دەکرێ ڕاست بێ یا درۆ. (درآمدی برزبان شناسی- ڤیکتریا فرامکلین و رابرت رادمن و نینا هیمز، ل٦٨٦. و/ کوردی)

[٢]- sovereign good، واتە چاکە یا باشیی زاڵ

[٣]- sensual pleasure

*بەهێزترن لەو زەینانەی بازنەیین*)، دەتوانین بە ڕێکی بڵێین کە بەندی وابەستە، بە واتایەك **هەڵەیە**، چونکە چەمکی *چوارگۆشە بوون* لەگەڵ چەمکی *زەین لە پلەی سەرەکی بیرکردنەوەدا* ناگونجێ (ل ١٢٤).

بەم پێیە بنەمای ئەو ڕستانەی، کە خاوەنی بەندی وابەستەی لێکدانەوەیی و دیاخەر، لە ڕاستیدا لەسەر پایەی سیتمی گوزارەکانن (*مانای ئەو دیاردە ئەبستراکتانەی کە مانای ڕستەکان دخولقێنن*)[١] ، وەلێ میتۆدی پەیوەندی ئەوانە، لە بەندی لێکدانەوەیی و دیارکەریی دا جیاوازە. لە بەندی لێکدانەوەیی دا دەرهاویشتەیەکی بونیادی پەسند دەکرێ، بەڵام لە بەندی دیارکەردا، ئەو گوزارەی کە لە جێگۆڕکێی ڕاناو یا سەرچاوەکەی وەدەست دێ، پەسند ناکرێ، بەڵکو گوزارەکە لەگەڵ ئەو ناوەدا چەمکێکی ئاوێتە دروست دەکات.

بەدڵنیاییەوە ئەم ئەم بیروباوڕانە خۆیان لە خۆیاندا ڕاستن و، هەر تیۆرییەکی ڕستەسازی کە بیهەوێ چەمکی **ژێرساز** بە وردی ڕوون بکاتەوە و، ئەو ڕێسایەی کە ژێرساز بە رووسازەوە دەبەستێتەوە، تاوتوێ و تۆماری بکات، بێ گومان پێویستە بایەخیان پێبدات. هەرچۆنێك بێ، دەبێ ئەم بیروبۆچوونانە بە ڕێبازی **دەستووری گەردانکردنی بەرهەمهێن**[٢] لەبەرچاو بگیرێن. تیۆرییەکی ئاوا باسی ڕێسایەك دەکا، کە ژێرساز دیاری دەکا و دەیبەستێتەوە بە رووساز و، ڕێساکانی لێکدانەوەی

---

[١]- هەروەها دەبێ بزانین کە پێکهاتەی ئاوەڵناو - ناو لە رووسازدا، دەتوانێ بە هوی ئەو جۆرە گەردانکردنانەی، کە لە دەستووری پۆرت ڕۆیاڵ دا هاتووە، لە هەریەکێکیان دەتوانین دووە جۆر (وابەستە) دروست بکەین. ئەم بابەتە لەو نموونانەی لێرەدا هاتوون و گرینگتر لەوەش لە نموونە ناروونەکانی **یەسپرسن** دا وەك ڕستەی ژێرەوە، بە ڕوونی دەبینرێ:

The Industrious Japanese will conquer in the long run.

[٢]- transformational generative grammar

مانایی و مۆرفیمی، کە بە ریز لە ژێرساز و رووسازدا ئەنجام دەدرێن. بە واتایەکی تر ئامانجی تیوریيەکی ئاوا، تارادەیەکی زۆر روون کردنەوە و پێرستکردنی ئەو چەمکانەیە، کە لە دەقەکانی سەرەوەدا سەرپێی ئاماژەمان پێکردووە و لە هێندێك رووەوە بە تایبەتی پێرست کراون. بەرای من لە زۆر رووەوە بە تەواوی راستە ئەگەر **تیوری دەستووری گەردانکردنی بەرهەمهێن**، دەك لە بەرهەمەکانی هاوچەرخدا هاتووە، لە راستی دا بە گێڕانەوەیەکی نوێ و رەوانتری **تیوری پۆرت رۆیاڵ** ئەژمار بکەین.

لە تیوری پۆرت رۆیاڵ دا راناوی پەیوەندی کە لە رووسازدا دەردەکەوێ، هەمیشە رۆڵی جێگرەوەی دووفاقی **ناو** و پێکەوە بەستنەوەی گوزارەکانی نییە، بەڵکو دەکرێ (*تەنیا وەك راناو بەکارببرێ*) و تەنیا دووەمین رۆڵ بگێڕێ. بۆ نموونە، لەو رستانەی وەك (*پێموایە ئێوە ئاقڵ بن*) و (*من پێتان دەڵێم ئێوە زۆر تاوانکارن*)، دەبینینن، لە رووسازدا گوزارەی وەك (ئێوە دەبێ ئاقڵ بن و ئێوە تاوانکارن) لە بەشە گوزارەیەکی تەواو بەولاوە شتێکی تر نییە: (*پێم وایە و هیتر، من بە ئێوە دەڵێم و هیتر*) (*دەستوور* ل٧٣)[١]

---

[١]- دەبێ ئاگادر بین کە لە حاڵەتێکی ئاوادا، راست نییە بڵێین هەر یەکێك لەو توخمە ئەبستراکتە سەرەتاییانەی **ژێرساز** دروست دەکەن، خۆی دەتوانێ ببێتە بنەمای رستەیەك. لەبەرئەوە، بۆ نموونە je vous dis رستە نییە، ئەگەر بمانەوێ کەڵك لە زانیياریيەکانی ئەمڕۆکە وەربگرین، دەبێ بڵێین ئاوا نییە، کە هەرکامێك لەو کەرەستانەی بە رێساکانی دروستکردنی پێکهاتە بەرهەم بێ، بتوانێ ببێتە بنەمای رستەی سەرەکی!. بەم شێوەیە لە تێکڕای بەرهەمەکانی **دەستووری گەردانکردنی بەرهەمهێن**، لەم دەساڵەی دوایی دا، هەمیشە ئەم بابەتەیان بە ئاسایی زانیوە، کە رێساکانی دروست کردنی پێکهاتە دەتوانن هێمای ساختە وەدیبێنن، کە تەنیا لەبەر کارایی هێندێك رێسای دەروونیانە (وەك پێکهاتەی کار- تەواوکەر لە زمانی ئینگلیزی دا) بە هۆی زنجیرەیەك زاراوە دووبارە دەردەکەونەوە و، ئەو زنجیرە سەرەتاییانەی کە ئەو هێمایە

له کتێبی *دەستوور* دا هاتووه که رۆڵی پێکهاتەی چاوگی لـه دەزگـای **فەرمانیـدا** هاوشێوەی ئەو رۆڵەیه که بەنده  وابەستەکان له دەزگای **نـاویی** دا دەیگێـڕن، بـەم مانایـه کـه ئامرازێـك بـۆ بـەرفراوان کردنـی دەزگـای فـەرمانی، لـه رێگـەی بەسـەرکردنەوەی تێکـڕای گوزارەکانـەوه دەسـتەبەر دەبـێ: (چـاوگ یەکێکـه لـه حاڵەتەکانی کار، هەروەك چۆن راناوی پەیوەندی یەکێکـه لـه حاڵەتـەکانی رانـاو. ل١١١و ١١٢) و (چاوگ، وەك راناوی پەیوەندی، سەرەڕای دەربڕینی کار(فـەرمان) دەتوانێ لەو شوێنەدا که موڵکی گوزارەیەکی تره، پەیوەندنی بەو گوزراەوه بکات. ل١١٢)، کەواته مانای scio malum esse fugiendum  ژێرسـازێك دیـاری دەکا که له دوو گوزاره پێك دێت. رسته ئەم گوزارانـه scio هـەروەها  malum est fugiendum ە. رێسای گەردانکردن (به واتای ئەمڕۆ) که رووسازی رستەکه دروسـت دەکـات est لـه جێگـای esse دادەنـێ. هـەر بـەو شـێوەی کـه ئـەو گەردانکردنانەی رستەی وەك (خواوەندێ ك که هەیه نادیاره، جیهانێ ك که هەیـه خولڤانـدی) دروسـت دەکـەن، کـردەوەی جیـاواز ئـەنجام دەدەن وەك جێگـۆڕکێ و گواستنەوه و لابردن له سیستمەکانی ژێرسازی گوزارەکان (*لەبەر ئەم لایەنەیـه کـه له زمانی فەرەنسیدا، تارادەیەك هەمیشه چاوگ له گـەڵ لایـەنی هـەواڵی کـار و ئامرازی (que) نیشان دەدەین، دەزانین که هـەڵاتن جـوان نییـه... ل١١٢*). لـەم حاڵەتەدا ناسنامەی **ژێرساز** له فەرەنسی و لاتینی دا ئەو دیفاکتۆیه لەکەدار دەکا،

---

ساختانەی تیدا دەبینرا، بنەمای رستەگەلی سەرەکی نـین. بـیروڕای جیـاواز وەلێ پێکپەیوەسـت کـه لـەم دوو حاڵەتەدا بەرجەسته بوون، لەم کتێبەی خوارەوەدا باسکراوه:

Chomsky, Aspect of the theory of syntac, chp. III.

که ئەم دوو زمانە کەڵك لە گەردانکردنی جیاواز وەردەگرن بۆ سیمای رووسازی رستە.

دواتر **دەستوور** دەڵێت، دەتوانین گواستنەوەی وتەی ناراستەوخۆ بە هەمان شێوە شیبکەینەوە[1]. ئەگەر گوزارەکە دەروونیی و ژێرسازیی و پرسیارییە، ریسای گەردانکردن si لەبری que بەکاردێنیٚ، وەك: on mademande si je pouvais cela (*لێم دەپرسن کە ئایا دەتوانین ئەو کارە ئەنجام بدەم*) کە (*باسی خاڵێك دەکەم*) هەرئەمەیە (pouvez- vous fair cela ?) ئایا دەتوانی ئەو کارە ئەنجام بدەی؟ لە راستیدا هێندێك جار تەنیا گۆڕینی کەسەکە بەسە و پێویستی بە پێوەلکاندنی شتی تر نییە. وەك (*لە منی پرسی: ئێوە کێن؟*) لە بەرامبەردا (*لە منی پرسی من کێم. ل١١٣*).

ئەگەر بمانەوی هێڵەگشتییەکانی **تیوری پرۆت رۆیاڵ** کورت بکەینەوە، دەتوانین بڵێین، رستە لایەنێکی زەینی دەروونی هەیە، (*ژێرسازێك کە ماناکەی دەدا بەدەستەوە*) هەروەها لایەنی بابەتی و دەرەکی هەیە وەك زنجیرەی فۆنیتێکی. جیاکردنەوەی رووسازی رستەکە، رەنگە نەتوانیٚ پەیوەندی گرینگی ژێرساز بە نیشانە رواڵەتییەکان، یا بە پێرستی واقعی وشەکان، دیاری بکات. وێڕای ئەمە، چۆن گوتاری بابەتی بەرهەمدیٚ، ژێرسازیش ئاوا لە زەیندا رەنگدەداتەوە. **ژێرساز** سیستمێکی گوزاراەکان دەگرێتەوە، کە بە شێوەگەلی جیاواز رێکخراون. ئەو

---

[1] - **بۆزە** شیکردنەەیکی تری بۆ ئەم پێکهاتانە، لە هەمان سەرچاوەدا خستۆتە روو. نابراو ئەوانە بە **گیرەکی لکێنراو** دادەنیٚ، کە سەرچاوەکەیان بە یەك گەردانکردن لابراوە. کەواتە رستەکانی (بارودۆخی ئێستای مەسیحییەکان دەیسەلمێنی کە ئایینی ئێمە ئلاهییە) و (من وا بیردەکەمەوە کە خۆشم دەویٚ) بەریز لەم رستانە وەرگیراون (بارودۆخی ئێستای مەسیحییەکان راستییەك دەیسەلمێنی و راستییەکەش ئەمەیە کە ئایینی ئێمی ئلاهییە) و (من بیر لە شتێك دەکەمەوە ئەویش ئەمەیە کە خۆشم دەوێی). (ل٤٠٥)

گوزارە سەرەتایانەی کە ژێرساز دروست دەکەن بە شێوەی نیهاد-گـوزارە و لەگـەڵ نیهاد و گوزارەی سادەن (*مانای گوتەزان، نەك گوزارەی ئاڵۆزتر*). زۆر لەو گـوزاراە سەرەتایانە رەنگە سەربەخۆ بە شێوەی رستە دەرکەون. بە گشـتی نـاتوانین بڵێـێن، کە دەرهاویشتە سەرەتاییەکانی خولْقێنەری ژێرساز، ئەو کاتە پەسند دەکـرێن کـە رستە بنەمایەکەی بەرهەمدێ. بۆ نموونە بەندەکانی لێکدانــەوەیی و دیارخـەر لـەم رووەوە لێکجیان. بۆ بەرهــەمهێنانی رسـتەیەك، لــەو ژێرسـازەی خـاوەنی واتـای رستەکەیە، پێویســتە رێسـای گـەردانکردنی **گواسـتنەوە** و **جێگـۆڕکی** و **لابـردن**، بەکاربێنین. هەندێك لەم گەردانکردنانە بە زۆرن و هەندێکیان بە ئارەزوون. کەواتــە دەتوانین لەم رووەوە رستەی (*خواوەند کە دیار نییە، جێهانێکی خولْقاند کە دیـارە*) لە رسـتەی هاومانـای ئـەو واتــە (*خواوەنـدی نادیـار جیهـانی دیـاری خولْقانـد*) جیابکەینەوە، ئەویش لەبەرئەوەی گەردانکردنی بە ئارەزوو، کاری لابردنـی ئـەنجام داوە. بەڵام ئەو گەردانکردنەی راناوی پەیوەندی بە قازانجی ناو لادەبا و دواتر پلەی راناو بەرزدەکاتەوە، بە زۆرە واتە بەئارەزوو نییە.

ئەم بابەتانە تەنیا پەیوەندییان بەو رستانەوە هەیە، کە بە تایبەتی لە سەر بنەمای دەرهاویشتەن. وەلێ ئەم رستانە، هەرچەندە شێوەی سەرەکی بیرکردنەوەن، هــەموو **کـردەی زەینـی ئێمــە** نـین و (پێویسـتە دیسـانەوە بلْـێین کـە پێکـەوە لکانـدن و جیاکردنەوەی رستەکان و لایەنی تر، هەموویان مەودای کردەی هاوشـێوەی زەینـی ئێمەن و، نیشاندەری تێکڕای ئەو کردانەی تری زەیـنن، وەك، ئـارەزوو، فـەرمان و داخوازییەکان و هیتر. ل٢٩). هەندێك لــەو شـێوانەی تـری بیرکردنــەوە بــە پیتـی تایبەتی ergo, si, vel, non و هیتر دیاری دەکرێن. ل١٣٧-١٣٨). بەڵام لــەم جۆرە رستانەشدا ناسنامەی ژێرساز، بەهۆی جۆراوجۆری ئامرازەکانی گەردانکردن،

به شاراوەیی دەمێنێتەوە، لە کاتێکدا کە رستەی واقعی دروست دەبن، ئەو مانایانەی لەبەر چاو گیراون ئیلهام (القا) دەکرێن. لەم رووەوە دەتوانین رستەگەلی پرسیاری بە نموونەی شایەت بێنینەوە. لە زمانی لاتین دا پیتی پرسینی ne *(بوونێکی بابەتی دەرەوەی زەینی نییە، تەنیا کردەی زەینی ئێمە نیشان دەدات، کە بەهۆی ئەو زانینەوە ئارەزووی شتێك دەکەین. ل١٣٨* ). راناوی پرسین *(جگە لە راناوێك کە نیشانەی ne پێوە دەلکێنرێ شتێکی تر نییە، مانای سەرەڕای ئەوەی وەك راناوەکانی تر جێگای ناو دەگرێتەوە، کردەی زەینی ئێمە دەنوێنێ، کە دەیەوێ شتێك بزانێ یا شتێك وەدی بێنێ. ل١٣٨* ). بەڵام دەتوانین بە میتۆدی تر، جگە لە پێوەلکاندنی پیت، ئەم **کردە زەینیە**[١] دیاری بکەین، میتۆدی وەك پێناسەکردن، یا پێچەوانە کردنەوەی پێڕستی وشەکان، وەك زمانی فەرەنسی کە لەوێدا راناوی بکەری لە موقعیەتی دوای ناسینی کەسەکە لە کار دا دەگوازرێتەوە و (هاورێکی شیوەی ژێرساز وەك خۆی دەمێنێتەوە). ئەمانە هەموویان ئامرازن بۆ دەرکەوتنی ژێرسازی یەکسان. (ل١٣٨و ١٣٩).

دەبێ بزانن کە تیورری **ژێرساز** و **رووسازی** لە توێژینەوەکانی پۆرت رۆیاڵدا، وەك هەر تیورییەکی کاریگەر، بە شێوەیەکی پەنهانی چەندین ئامرازی دووبارە کردنەوەیە، واتە لە چوارچێوەی ئەو تیوریییەدا دەتوانین بە شێوەیەکی بێ سنوور،کەڵك لە چەند ئامرازی دیاری کراو وەربگرین *(بە واتایەکی تر کەڵکی بێ سنوور لە ئامرازگەلی سنووردار وەربگرین. و/کوردی)*. سەرەڕای ئەوە، دەبینین لەو نموونەکانی سەرەوەدا، ئامرازەکانی دووبارە کردنەوە، خاوەن هەل ومەرجی تایبەت

---

١- movement of the soul لە دەقە ئینگلیزییەکەدا بزاوتی رووح نووسراوە وەلێ لەبەر ئەوەی لەئاراستەی بابەتەکە دووە هەمان کردەی زەینمان بەکارهێنا کە دەبێتە- mind action

و روالّەتین، بەکارهێنانیان پێویستی بە هیچ نیازێکی پێوشوەخت نییە. لە هەردوو حالّەتی سەرەوەدا (*وەك پێتەکانی پەیوەندی و پیتەکانی جیاکردنەوە و هیتر*) و حالّەتی تری سەرنجراکیش، کە لەمەڕ چاوگ و راناوەکاندا وترا، تەنیا رێگەی پەرەپێدانی **ژێرساز**، پێوەلکاندنی گوزارەی تەواوە بە ئاوێتەی نیهاد-گوزارە. **رێساکانی گەردانەدنی**[١] لابردن و ریزکردنەوە و هیتر، هیچ رۆڵێکیان لە بەرهەمهێنانی پێکهاتە نوێیەکاندا نییە. بەلاّم پەیڕەوانی دەستووری پۆرت رۆیالّ، تا چەند لە تیوری خۆیاندا ئەم تایبەتمەندیانەیان بەسەرکردۆتەوە و لێیان ئاگادار بوون، هێشتا نادیارە.

لەسەر بنەمای تیورییەکانی ئەمڕۆ، دەتوانین بۆچوونەکانی ئەوان بە لێکدانەوەی سنتاکسی بە شێوەیەك کە دوو سیستمی رێسایی بگرێتەوە، بخەینە روو: **سیستمی بنەما**[٢] کە **ژێرساز** دروست دەکات، و **سیستمی گەردانکردن**[٣] کە ژێرساز بە شێوەی **رووساز** دەردەخات. سیستمی بنەمایی خاوەنی رێسایەکە کە پەیوەندییەکانی دەستووری سەرەتایی بە شێوازی بابەتیانە دروست دەکات (*رێساکانی نووسینەوەی دەستووری یەکەی سینتاکسی*[٤]). سیستمی گەردانکردن یاساکانی لابردن، ئاوێتە کردن، دووبارە ریزکردنەوە و هیتر لە خۆدەگرێ. **رێساکانی بنەما** زەمینە خۆش دەکەن بۆ هێنانە ئارای گوزارەی نوێ: (مانای رێساکانی نووسینەوە بە شێوەی...

---

١- Transformational Rules

٢- base system

٣- transformational system

٤- The Grammer of Constituent Stracture فارسییەکەی (دستور ساخت سازە) کە بریتییە لە میتۆدی رێکخستنی یەکە سینتاکسییەکان بەپێی پلەی زمانییان لە رستەدا، وەك گروپی فرمانی و ناویی

A بـۆ...s...کـە لەوێـدا S هێمـای سـەرەتایی **دەسـتوور فرێـز**[1]ە کـە بنـەما پێکدێنێ). هیچ ئامرازێکی تری دووبارە کردنەوە بوونی نییە. لە گەردانکردنـەکان دەتوانین گەردانکردنی پرسین، فەرمانیی و هیتر ناوببەین، کە ئەو کاتـە دەسـبەکار دەبن کە **ژێرساز** بیانگرێتەخۆ، (*مانای کاتێك کە **ژێرساز** کردەی زەینـی گونجـاوی هەبێ*)[2].

وێدەچێ دەستووری پۆرت رۆیالْ یەکەمین دەستوور بـێ کـە بیرۆکـەی **پێکهاتـەی فرێز**[3] بە روونی لێکداوەتەوە. کەواتە باشە بزانین کە ئەم کتێبە بە روونی، ناتـەواوی لێکدانەوەی سازەیی لە دووبارە دەرخستنەوەی پێکهاتـە سینتاکسـییەکان نیشـان دەدات و ئامـاژە بـە جـۆرێکی دەسـتووری گـەردانکردن دەکـات، لـە زۆر رووەوە هاوشێوەی دەستوورێکە کە ئەمڕۆ لێکۆڵینەوەی زۆری لەسەر کراوە.

ئەگـەر لـە چـەمکە گشـتییەکانی پێکهاتـەی دەسـتووری تێپـەڕین و، بگەینـە بابەتگەلی دیاریکراوی شیکردنەوە، دەبینین کە دەستووری پۆرت رۆیالْ کاری زۆری کـردووە بـۆ خسـتنە رووی تیـوری **ژێرسـاز** و **رووسـاز**. لـە زۆر حاڵەتـدا

---

[1] - یەکەی سینتاکسی یا رستەسـازی لـە دروسـت کردنـی رسـتەدا = constituent کـە فرێـز یەکەیـەکی سینتاکسییە

[2] - بۆ بەدواداچونی پتر بڕوانە:

Chomsky, Aspecte of the theory of syntax.

شایانی باسە بە درێژایی ئەم چەند ساڵەی، کە تیوری **دەستووری گەردانکردنی بەرهەمهێن**، بۆتـە بابـەتێکی لێکۆڵینەوە، بەربەرە بەڵگەی نوێ دەسکەوتووە، کە لە زۆر رووەوە لاگیری ئەو روانگەیە، کە ناڕاستەوخۆ لـە تیوری پۆرت رۆیاڵەوە هاتووە.

[3] - هێندێك چەمکی سەرەتایی **ساهلین** (هەمان لاپەڕە ٩٧ بەدواوە) تاوتوێی کردوووە. ئەم بڕوایە کە دەتوانین رستە بە زنجیرەیەك زاراوە یا گوتەزا بێ هێچ پێکهاتەیەك، لەبەرچاو بگرین، زۆر نووسەری ئەم دواییە باسـیان کردووە، (بێ ئەوەی بزانین باوڕیان پێی بووە یان نا).

ئاوەڵکردارەکانیان بە زادەی نیازی مرۆڤ (*مرۆڤ بۆ کورت کردنەوەی وتە. ل٤٢*) زانیوە، واتە شێوەی لابراوی پیتی لکاو- ناو، وەك sapienter, لەبری cum sapentia وەیا hodie لە بری in hoc die ل٨٨). بەم پێیە، کارەکان بەم شێوەیە خراونەتە روو، کە بە شێوازێکی پەنهان، خاوەنی کاری پەیوەندیین، کە نیشانەی پەسند کردنە و داشکانە بەلای کورتکردنەوەی دەربڕینی بیرکردنەوە. کەواتە کار لە راستیدا (*زاراوەیەکە، ئەرکە سەرەکییەکەی*[1] *خستە رووی پشتراستکردنەوەیە: مانای خستنە رووی ئەم خاڵە، کە وتە لەو شوێنەی بەکار هاتووە وتەی تاکە، کە نەك تەنیا پەی بە بابەتەکان دەبات، بەڵکو لێکدانەوەیان بۆ دەکا و پشتڕاستیشیان دەکاتەوە. ل٩٠*). کەواتە بەکارهێنانی کار مانای ئەنجامدانی ئیشە و نەك گەڕانەوە بۆ پەسند کردنی شتێك وەك (*بابەتی سەرقاڵی زەینی ئێمە*) هەروەك کەڵك وەرگرتن لە (چەند ناو کە ئەوانیش پشتڕاستکرنەوە نیشان دەدەن، وەك( affirmans, affirmation ل٩٠) . بەم پێیە رستەی (Pierre vit پییەر ژیان بەسەر دەبا) و رستەی لاتینی petrus affirmat پیرۆس ژیان بەسەر دەبا) کاری affirmat بە هەمان مانای est affirmat (پشتراستکەرەوە) یە. لە رستەی affirmo کە لەوێدا بکەر و پیتی پەیوەندی و ئاوەڵناو هەرسێکیان لە یەك وشەدا کورت بوونەتەوە) دوو جۆرە جەخت کردنەوە بەئەنجام دەگات: یەکێکیان لەمەڕ کردەوەی بێژەر بە پێداگرتن لەسەر شتێك و

[1]- سەیرکەن ئەمەیان وەك یەك بنەما لەبەرچاو گرتووە، نەك رۆڵی تایبەت بە تاکی کارەکان، کارەکان یا فەرمانەکان (بۆ دیاری کردنی ئارزووەکانی تری زەینی ئێمە وەك حەز، داخوازی، فەرماندان و شتی تر بەکار دەبرێن. ل٩٠) ئەم پرسانە لە بەشی ١٥ی دا خراونەتە روو. لەم بەشەدا، میتۆدە دەستوورییەکان کە لە رێگەی ئەوانەوە ئەم حاڵەتانە و پرۆسە زەینییەکان پراکتیزە دەکرێن، بە کورتی شرۆڤە کراون. بڕوانە ل٤٥ و ٤٦ ئەم کتێبە.

ئەویتریان جەخت کردنەوەی ناوبراو(*لێرەدا لە بارەی خۆی دا*). بەم شێوەیە (*کاری nego یەك **نکۆڵیکردن** و یەك **جەخت کردنەوە** دەگرێتەوە. ل٩٨*)[١].

بە کۆکردنەوەی ئەم راوبۆچوونانە، لەو چوارچێوەیەدا کە نموونەمان هێنایەوە، ئەوەی پەیڕەوانی **دەستووری پرۆت رۆیاڵ** دەیڵێن ئەمەیە: ژێرساز رستەی وەك (*پییەر ژیان بەسەر دەبا*) یا (*خوا مرۆڤی خۆش دەوێ*) (لۆجیك ل١٠٨) یەك کاری پەیوەندییان هەیە کە پێدرگرتنەکە دەخاتە روو، هەروەها یەك گوزارەی هەیە (ژیان بەسەر بردن و خۆشویستنی مرۆڤ) کە پەیوەندی بە بکەری رستەکەوە هەیە. کارەکان گوتەی لاوەکی گوزارەکان پێکدێنن و گەردانکردنێك کاریان پێدەکات، کە لەگەڵ کاری پەیوەندی دەیانکا بەیەك وشە.

لە لۆجیکدا، شیکردنەوەی کار (فەرمان) پانتاییەکی زۆرتری هەیە، وا دەردەکەوێ (ل١١٧) بە پێچەوانەی رواڵەت، ئەو رستەی کە کاری تێنەپەڕ و نادیاری هەیە **گوزارەیەکی ئاوێتە**[٢] و لە هێندێك حاڵەتدا دوو گوزارە دەربڕێ. کەواتە دەتوانین رستەی (*پرۆتۆس ستەمارێکی کوشت*) بەم شێوەیە پێچەوانەی دەکەینەوە ئەگەر بڵێین (پرۆتۆس کەسی نەکوشت)، وەیا (*ئەو کەسەی پرۆتۆس کوشتی ستەمکار نەبوو*)، کەواتە ئەم رستەیە دەرخەری گوزارەیەکە کە (*پرۆتۆس کەسێکی کوشت کە ستەمکار بوو*)، وە ژێرساز رستەکە دەبێ ئەم دیفاکتۆیە بخاتە روو، وێدەچێ بە پێی رێبازی ئەم لۆجیکە، هەر ئەم شیکردنەوەیە بۆ رستەی تر بەکار بێنین کە ئاوەڵناوەکەیان تاك و دیار بێت، وەك (*برۆتۆس سیزاری کوشت*).

---

[١]-دواتر لە دەستووردا دەردەکەوێ کە هەڵەیە، وەك هێندێك لە پەیڕەوانی دەستووری پێشکەوتوو، گریمان کارەکان کردەیەك یا هەستێك یا شتێکن کە روودەدەن، بۆ رەتکردنەوە ئەم مانایە، کاری وەك: existit, quiescit, fright, alget, tept, calet, albet, viret, claret بە نموونە هێناوەتەوە.

[٢]- a complex proposition

ئەم شیکردنەوەیە لە **تیوری لێکدانەوە**[1]دا کە لە کتێبی **لۆجیك** دا هاتووە، دەوری هەیە. بۆ دارشتنی تیورییەك کەڵك لەم شیکردنەویە وەردەگیرێ، کە لە راستیدا جۆرێکە لە تیوری ناتەواوی پەیوەندییەکان، هەر لە سەر بنەمای ئەو تیورییە، دەتوانین تیوری پێوانەی شێوەیی بۆ ئەو مشتومڕانە بەکار ببەین، کە لە بارودۆخی ئاساییدا دەکرێ ئەنجام بدری. لە ئاکامدا دەتوانین بڵێین (ل٢٠٦ و ٢٠٧) لەم دوو رستانە (*یاسای ئیلاهی، فەرمان دەدات پەیڕەوی پاشاکان بین*) و (*لویی چواردەهەم پاشایە*) ئەم رستەیە هەڵێنجین: (*یاسای ئیلاهی فەرمان دەدا پەیڕەوەی لویی چواردەهەم بکەین*) هەرچەندە ئەم رستانە بە رواڵەت ئەو مەبەستە نادەن بە دەستەوە[2].

کەمکردنەوەی رستە بۆ **ژێرساز** لە بەشەکانی تری کتێبی لۆجیکدا هاتووە. بۆ نموونە، **ئارنۆڵد** پێی وابوو (ل٢٠٨) کە رستەی (*ئەو شوانانە کەمن کە گیانایان دەکەنە قوربانی مێگەلەکەیان*) هەرچەند لە رووی سیماوە ئەرێنییە، لە راستیدا بە شێوەیەکی شاراوە رستەی نەرێنی (*ئەمڕۆکە زۆر لە شوانەکان ئامادە نین گیانیان بۆ مێگەلەکەیان بکەنە قوربانی*). ئەو چەندین جار دووبارەی دەکاتەوە کە ئەوەی بە (رواڵەت) ئەرێنی یا نەرێنییە، رەنگە لە رووی ماناوە، واتە لە ژێرساز دا وەها

[1] -theory of reasoning

[2]- هەروەك پێشتر ئاماژەی پێکرا، ل١١٧) (زۆرجار پێویستە بۆ دانانی نیهاد، لە سروشتی ترین دۆخی خۆی دا و خستنە رووی ئەوەی پێویستە بسەلمێنرێ، لە حاڵەتی دیار بیکا بە حاڵەتی نادیار).

نەبێ. کورتی وتە ئەمەیە: رەنگە **شێوەی لۆجیک**[1]ی و **راستەقینەی** رستە بە تەواوی لەگەڵ دەستووری و رواڵەتی رستەکەدا جیاواز بێت[2].

لەم قۆناغەدا، بۆ روون کردنەوەی پەیوەندییە گرینگەکانی مانایی، کە لە ناو توخمەکانی وتەدا هەیە، جەخت لەسەر چییەتی ژێرساز دەکرێتەوە، وەك بنەمای جۆراوجۆری شکڵە رواڵەتییەکان لە زمانگەلی جیاوازدا. بەشی شەشەمی کتێبی **پۆرت رۆیاڵ** ئەم پەیوەندیانە تاوتوێ دەکا، لە سیستمەکانی حاڵەتدا (بەو شێوەی لە زمانی کلاسیك دا هەیە) وە لە گۆرانکاری دەروونی دا (وەك بارودۆخی پیکهاتەیی لە زمانی عیبری دا) یا بەتەوەاوی لە رێخستنی[3] رستەدا (وەك پەیوەندی بکەر- کار و کار - بەرکار لە زمانی فەرەنسی دا). ئەوانە هەموویان بە

---

[1] - Logical form

[2] - دادوەرانە نییە ئەو تێڕوانینە بگێڕینەوە بۆ فەلسەفەی سەدەی بیستەمی بەریتانیا و بە (بە دۆزینەوەی سەرەکی و بنەمایی) بزانین. بڕوانە:
Flew Itrodution to Logic and Language. First Series, Oxfoerd, Blackwell, 1952. p.7, or Wittgenstein Tractatus -philosophicus, 1922.
لە کاتێکدا بە هی **راسلی** دەزانن.
هەروەها ئەم روانگەیە کە (رەنگە هاوشێوەیی و ناهاوشێوەیی دەستووری، لە رووی لۆجیکییەوە، رێی بزرکەر بێ. Flew. P. 8) بەو ئەندازە جوان نییە کە **فلیو** بانگەشەی بۆ دەکا.
گریمانەی گشتی زمانناسی دیکارتی ئەمەیە، کە رەنگە پێکهاتەی رواڵەتی رستە، رەندگدانەوەی تەواو و کامڵی پەیوەندییە دەستوورییەکان نەبێ، کە ناوەرۆکە ماناییەکەی دەور دەبینێ، هەروەك بینیمان کاتێك تیورییەکی دەستوور دەخرێتە روو، کە لە وێدا رستە واقعییەکان لە ژێرسازی بنەڕەتی وەردەگیرێن و، ئەو پەیوەندییانەی ژێرسازیان دەرکەوتەی دەستوورین. **شکڵە لۆجیکییەکان** بەراستی تا چ رادەیەك بە هۆی ژێرسازسان لە رووی رستەسازی دیاریکراو دووبارە دەردەکەون، چ لە چەمکی نوێی و چ لە روانگەی زمانناسی دیکارتی دا؟، پرسیارێکە هێشتا وەڵامی نەدراوەتەوە. بۆ بەدواداچوونی پتر بڕوانە:
J. Katz, The Philosophy of Language, Harper &Row (1966).

[3] - پێی دەوترێ **رێکخستنی سروشتی** =Natural arringment .

رەنگدانــەوەی پێکهاتەیــەکی بنــەمای لەبــەر چــاو دەگیرێــن، کــە لــە نــاو هــەوو زمانەکاندا هاوبەشن و نیشاندەری پێکهاتەی بیرکردنەوەن. **لامی** هەربەم شـێوەیە، لە وتارێکی دا ئاماژە بــە ئــامرازی جۆراوجــۆر دەکــات، کــە زمانگــەلی جیــاواز بەکاریان دێنن تا (ئارەزووەکان، هەواڵ، و تێکڕای ئەو راو بــیر و بۆچــوونانە بخاتــە روو، کــە بینینــی شــتەکان لــە زەینــی ئێمــەدا دەیخــولقێنێ. (ه س ۱۰ و ۱۱). **دۆمارسییە** کە لە خاوەنانی ئەنسکلۆپیدیایە، ئەویش جەخت لەسەر ئەم واقعیەتــە دەکاتەوە، کە سیستمی حاڵەت، ئــەو پەیوەندیانــە یەکالادەکاتــەوە کــە لــە نێــوان توخمەکانی وتەدا هەن، کــە لەزمانــەکانی تــر بــە پێــی ریکخســتنی وشــەکان یــا ئامرازەکانی پەیوەندی، دەخرێنــە روو. نــاوبراو ئامــاژە بــە هاوپەیوەنــدنی نێــوان ئازادی گواستنەوەی پارچەکانی رستە و جۆرەکانی گەردان کردن، دەکات[١].

پێویستە ئاگادار بین، کە بوونی کۆمەڵێکی وەك یەك پەیوەندی گریمانەکراو، کە لــە پێویستی بیرکردنەوەوە سەرهەڵدەدەن، زارەوەکانی هەر زمانێــك دەتــوانن، بەشــدار بن لەو پەیوەندییانە. پەیڕەوانی دەستووری فەلسەفی، نایانەوێ نیشــانی بــدەن کــە هەموو زمانەکان خاوەنی سیستمی حاڵەتن، یا کەڵك لە گردانکردن وەردەگــرن بــۆ خستنە رووی ئەو پەیوەندییانە. بە پێچەوانەوە ئەوانە بەردەوام دەڵێن کە سیستمی حاڵەت تەنیا یەکێکە لە ئامرازەکانی روونکردنــەوەی ئــەم پەیوەندییانــە، جارێــك

---

[١]- زۆربەی بەرهەمە بڵاوکراوە و بڵاونەکراوەکانی **دۆمارسییە**، لە بــارەی زمانــدا دوای مردنــی لــەم کتێبــەی خوارەوەدا بە چاپ گەیشتن:

Logique et Principes de Grammair (1769)

ژمارەی لاپەڕەکان تایبەتن بەم کتێبە. زۆر نووسەری تری وەك **ئادام سمیز** لەم کتێبەی خوارەوەدا ئاماژەیان بە هاوپەیوەندی نێوان رێکخستنی وشەکان و گەردانکردن کردووە:

Considerations Concering the first Formation of Languages. 

دەڵێن تەنیا بۆ مەبەستی فێرکردن دەتوانین بۆ ئاماژە کردن بەم پەیوەندییانە کەڵك لەو ناوانە وەربگرین، هەروەها بەڵگە دێننەوە کە هێندێك جار رەنگە سادەکاری، ببێتە هۆی ئەوەی جیاوازی لە نێوان حاڵەتەکان دابنێین، تەنانە ئەگەر هیچ جیاوازییەکیش لە رواڵەتەکەدا نەبێت. ئەم راستییە کە زمانی فەرەنسی سیستمی حاڵەتی نییە، لە دەستوورەکانی پێشوودا لەبەرچاو نەگیراوە. (لەگەڵ **ساهلین** بەراوردی بکە ل٢١٢).

خاڵی گرینگ ئەمەیە: کە بزانین کەڵك وەرگرتن لە ناوەکانی حاڵەتە نەریتییەکان، بۆ ئەو زمانانەی گەردانکردنیان نییە، مانای هاوشێوەی ئەو پەیوەندییە دەستووریانە دەگەیەنێ، مانای ژێرسازی هەموو زمانەکانی جیهان یەکسانن، هەرچەندە دوور نییە رێبازی دەربڕینیان جیاواز بێ. راستی ئەم وتەیە - هەرچەند دەتوانین بە گریمانەیەکی گرینگی بزانین - جێگای دڵنیایی نییە، وەلێ تا ئەو جێگایەی ئێمە بزانین لە سەر بنەمای داتا یا زانیاریە نوێیەکانی زمانناسی، ناتوانین ئەمە رەتبکەینەوە[1].

---

[1]- کاتێك کە **بلۆمفیلد** و زۆر کەسانی تریش، رەخنە لە زمانناسی پێش زماناسی نوێ دەگرن، بە هۆی دیاری نەکردنی جیاوازی پێکهاتەیی نێوان زمانەکان (بەهۆی گونجاندنی لێکدانەوەکانیان لە چوارچێوەی دەستووری زمانی لاتین دا. زمان ل٨)، بەرواڵەت ئاماژە بەم جۆرە بانگەشانە دەکەن کە گوایە نەسەلمێنراون. ئەگەر ئاوابێ، کەواتە پێویستە ئاگاداربین، کە کتێبەکەی **بلۆمفیلد** هیچ بەڵگەیەك نادا بەستەوە، تابزانین بۆچی بەو ئاکامە گەیشتووە، دەستووری فەلسەفی گیرۆدەی چوارچێوەی زمانی لاتینە، وە یا زمانناسی نوێ گومانی خستۆتە سەر گریمانەی دەستووری فەلسەفی، لە سەر بنەمای یەکییەتی پەیوەندییە بنەماییەکانی دەستووری. بەگشتی دەبێ بزانین، کە لێکدانەوەی **بلۆمفیلد** بۆ زمانناسی پێش زمانناسی نوێ، جێگەی بڕوا پێکردن نییە. تاوتوێکردنی مێژوویی ئەو تەنیا چەند بۆچوونی ناگونجاون، (ئەوەی زانایانی سەدەی هەژدەهەم لە بارەی زماندا دەیانزانی) ئەو کورتی دەکاتەوە. ئەم رادەربڕینانەی ئەو هەمیشە وردبینانە نین. (وەك جەخت کردنەوەی سەرسوڕهێنەرانەی ناوبراو، لەسەر ئەوەی کە زمانناسانی پێش سەدەی نۆزدەهەم، دەنگسازی

هەروەك لە سەرەو باسمان کرد دەستووری **پۆرت رۆیاڵ** لەسەر ئەم باوەڕەیە کە زۆربەی ئاوەڵکارەکان دروستکەری وتەیەکی ژێرساز نین، بەڵکو (*ئەرکی ئاوەڵکار تەنیا ئەوەیە کە ئەوەی نەتوانین بە هۆی ئامرازەکانی پەیوەندی (**پریپۆزیشن**) یا ناوێکەوە نیشانی بدەین، بە یەك وشە دەیخاتە روو. ل٨٨*). پەیڕەوانی دەستووریی (*مەبەست دەستووری پۆرت رۆیاڵ*)ە دواتر، ئەم تایبەتمەندییە کە زۆربەی ئاوەڵکارەکان پشت گوێ دەخەن. هەر لەم رووەوە بە بۆچوونی دۆمارسییە٠ ئەوەی ئاوەڵکار لە جۆرەکانی تری وشە جیادەکاتەوە ئەمەیە، کەئاوەڵکار بە هەمان ئەندازەی ئامرازەکانی پەیوەندی و ناو گرینگە و بەهاکەی بە هەمان ئەندازەی بەهای ئامرازەکانی پەیوەندی و تەواوکەرییەتی: قەید زاروەیەکە بە شێوی

---

گوتاریان دیاری نەدەکرد و لەگەڵ هێماکانی نووسین بە یەك شتیان لەقەڵەم دەدا، یا نووسەرانی **دەستووری هاوبەشی گشیتی** Universal Grammer، زمانی لاتینیان بەهۆی وەلانانی **بنەما گشتییەکانی لۆجیك** بەرز دەنرخاند). لە هەر شوێنێك بۆچوونەکانی ناوبراو ورد بن، لەوەی لەم قۆناغەدا ئەنجام دراوە بایەخێکی ئەوتۆیان پێ نەدراوە.

لەم قۆناغەدا ئەو میتۆدەی دەنگسازی گوتارییان لەسەر شی دەکردەوە، لێکۆڵینەویەکی جیای گەرەکە. جیاکردنەوەی ئەم بابەتە لەم باسەی ئێستا، واتە ئەوەی کەمن ئەنجامم داوە، بە تەواوی بە ئارەزووی خۆمە. زۆربەی ئەو بەرهەمانەی لێرەدا کەوتوونەتە بەر باس و زۆری تریش، ئەو باسانە دەگرێتەوە کە لەسەر دەنگسازین و، لە ناویاندا ئەم بۆچوونەی ئەرستۆ کە دیارە بێ هیچ بەرهەڵستییەك پەسند کراوە، دەڵێ: ئەو وشانەی دێنە سەر زمان، نیشانەگەلی زەینی وشەی نووسراون، کە بە هێمای وشەکانی سەر زمان ئەژمار دەکرێن.(De Interpritatione). لەم سەردەمەی ئێستادا زۆرجار ئاماژە بە دەنگسازی کراوە، بۆ نموونە **م. گرامۆن** لە بارەی دەنگسازی **کۆردۆموا** (هـ.س) ئاوا رای خۆی دەردەبڕێ: بەرهەمهێنانی ژمارەیەك دەنگ یا فۆنیمی زمانی فەرەنسی بە روونی و وردبینییەکی بەرچاو شرۆڤە کردووە)

(Traite De phonotique, Paris Libirari Delagrave, 1933, 44th ed 1950)

هەروەها لە سەر باسەکە دەڕوا (ئەمانە چەند لێکدانەوەیکن، کە **مۆلیێر** لە شانۆی **نەجیب زادەی بۆرژوا**، پەردەی دووەم، لاپەڕەی شەشەم، زاراوە بە زاراوە خستوویەتە روو).

کورتکراوە دەرکەوتووە. (ل٦٦٠). ئـەوەی نـاوبراو لـە بـارەی ئاوەڵکـاردا دەیڵـێ باسکردنێکی بێ مەرجە و لە درێژەی باسـەکەدا، توێـژێکی گـەورەی ئـەو توخمـە زمانیانە بەم شێوەیە (*مانای بە وتەی زمانناسانی ئەمڕۆ، لە رێگـەی **لێـوەرگرتن**[1] لە ژێرسازی رواڵەتی ئامرازەکانی پەیوەندی- تەواوکەر*) شیدەکاتەوە. **بوزە** پانتایی ئەم میتۆدەی شیکردنەوە فراوانتر دەکات.

ئەو بڕوای وایە کە هەرچەندە گوزارەی ئاوەڵکار وەك **لەگـەڵ ژیراییـەتی** لـە رووی **ماناوە** لەگەڵ ئاوەڵکاری **ئاقڵانە** جیاوازی نییـە، وەلێ رەنگـە **واتـای شـاراوە**[2] ی جیاواز بێ: (*کاتێك بابەتەکە دانانی کردەیەکە بەرامبەر یەك خـوو، ئاوەڵکـار پـتر تایبەتە بە نیشاندانی خوو، وە گـوزارەی ئاوەڵکـاری بـۆ نیشـاندانی کـردە. وەك ئەوەی بڵێین ئەو مرۆڤەی ئاقڵانە دەجوڵێتەوە ناتوانێ پەیمان بەخۆی بدا کە هـەموو کارەکانی ئاقڵانە ئەنجام بدات (ل٣٤٢)*[3]. ئەم جیاکردنەوەیە حاڵـەتێکی تایبەتییـە

---

[1]- لێوەرگرتن = Derivation یا **اشتقاق** عربی، مەبەست هۆنایاساییەکانی ورگرتن لە سیمای ژێرساز رستە بۆ بە وەستهێنای رووسازی رستە، یاوەرگرتنی سیمای دەنگسازی لە سیمای وشەسازە واتە وەرگرتنـی سـیمای فۆنۆلۆجی لە سیمای مۆرفۆلۆجی. و/ کوردی

[2]- accessory ideas، لە دەقە ئینگلیزییەکەدا مانی بیرۆکی یارمەتی دەرەکان دەگەیەنی، مەبەست ئەو مانا بزوێنەر یاسۆزدارییەیە کە پەیوەندی بە وشەیەك یا دوشەوە یا گوزارەیەکەوە هەیە کە مانای راشکاوانەی هەبێت. و/ کوردی

[3]- لە کتێبی **لۆجیکی پۆرت رۆیاڵ** دا، بەشی ١٤ و ١٥، جیاوازی کراوە لە نێوان (ئـەو وێنـا سـەرەکییانەی خراونەتە روو) لە رێگەی یەك شێوە زمانی و **وێناکردنی لاوەکی** وێڕای هەمان شێوە. وێنـا کردنـی سـەرەکی شتێکە کە بە **پێناسەگەلی زاراوەیی** لێکدەدرێتەوە و خوازیارە **واقعیەتی پراکتیکی** بە شێوەیەکی ورد دەبڕێ. پێناسەی زاراوەیی ناتوانێ ( تێکڕای ئەو کاریگەرییە دەربخا کە زاراوەی پێناسـەکراو دەیخاتـە سـەر زەیـن) و (زۆرجار زاراوەیك، سەرەڕای مانای سەرەکی، کە ئێمە بە مانای راستی زاراوەکەی دادەنێین، لە زەینی ئێمەدا دەبێتە هۆی هەوێنکردنی وێنای تر، ئەو وینایانە دەکرێ ناویان بنێین وێنا لاوەکییەکان، واتە هەرچەندە ئێمـە لە زەینی خۆماندا وەریدەگرین وەلێ بایەخی پێنادەین. ل٩٠). بۆ نموونە مانای سەرەکی **تۆ درۆت کرد** ئەمەیە

*(کە بێگومان لە هەموو زمانەکاندا هەیە، بۆ خۆدزینـەوە بـە دانـانی بەرامبـەری تەواو، ئەم بەرامبەر دانانە پەرە بە زمان نادات، مەگەر لـە رووی ئـەو دەنگانـەوە بێ، کە بۆ ساخڵەمی و روونی لێکدانەوە بێ کەڵکن).*

پەیڕەوانی کۆنتری دەستوور، نموونەی تری شـێکردنەوە لـە سـەر بنـەمای ژێرسـاز، دەهێننەوە، بۆ نموونە کاتێك کە رستەی فـەرمانی و پرسـیاری، وەك ئـەو گـۆڕاوە لابراوانەی رستە بنەماییەکان لەبەرچاو دەگرن، کە وێکڕا لەگـەڵ گوزارەکـانی وەك (*من فەرمانت پێدەکەم*) یا (*من داوات لێدەکـەم...*) دێـن. کەواتـە رسـتەی وەرن بمدۆزنەوە ژێرسازی ئەم رستەیە (*داوا لە ئێوە دەکەم بێن بمدۆزنەوە*) وە (*کێ ئـەوی دۆزییەوە ؟*) مانای (*من لەبارەی ئەو کەسەی دۆزییەوە دەپرسم*) و هیتر.

---

کە تۆ دەتزانی راستی پێچەوانەی ئەوەیە کە تۆ وتت. (بـەڵام سـەرەڕای ئـەم مانـا سـەرەکییە، ئـە زاراوانـە واتایەکی توڕەیی و دزێوی لەخۆدەگرن، بەو مانایەیە کە ئاخێوەر لە زیان پێگەیاندنت باکی نییـە- مانایەکـە زاراوەکانی ئەو هەم بەرجەستە و هەم دەکا بە سوکایەتی پێکردن). بەم پێیە ئەم رستەیەی **ڤیرجیل** (ئایا مردن پرسێکی شوومە؟) مانای ئەویە کە (مردن وەك ئـەوەی کەسـێك بـیری لێدەکاتـەوە ئەوەنـدە شـوم نییـە و ، وینەیەکی مردن دێنێتە ئاراوە، کە ململانێ لەگەڵ مردن دا دەکات و ئازایانە رووبـەڕووی دەبێتـەوە. ١٩١ و ٩٢). چەمکە لاوەکییەکان یا واتا لاوەکییەکان رەنگە وەك ئەو نموونەی سەرەوە (هەمیشە لەگەڵ زاراوە دابن) وەیا رەنگە تەنیا هاورێی وتە شەخسییەکان بن، وەك جوڵەی جەستەیی و دەنگی بەرز (ل٩٠). بە واتایەکی تر رەنگە ئەم پەیوەندییە هەم پەیوەست بێ بە زمانەوە و هەم پەیوەست بێ بە وتەوە.

ئەم جیاوازییە وەك جیاوازی نێوان مانای مەعریفەیی و مانای هەستییە. هەروەها ئەو نموونەیە لـەو بارەیـەوە کە چۆن هێندێك پرۆسەی دەستووری، دەتوانن مانای لاوەکی بگۆڕن بێ گۆڕینی مانـای سـەرەکی، پەیوەنـدی بەم بابەتەوە هەیە. لەسەر ئەم بنەمایە، دەڵێن کە تاوانبارکردنی کەسێك بە نـەزانی یـا دووروویـی، جیـاوەز لەگەڵ ئەوەی ناوی بنێی نەزان یا دووروو.، چونکە شێوەکانی ئاوەڵناوی (سەرەڕای مانای دیـاریکراوی خـۆی، واتایەکی بێزاری تێدایە، لە کاتێکدا ناوەکان تـەنیا ئـەو مانایـە دیـاریکراوە، بـێ تاوانبـار کردنـی لاوەکـی دەردەبڕن)

وەلیّ نموونەیەكی تر كە دەتوانین باسی بكەین، وەرگرتنی گەردانی ئەو گوزارانانــەن كە پێتی پەیوەندیان هەیە، لە رستەگەلی ژێرسازیی (*بۆ نموونە بڕوانە بوزە هــە س ل٣٩٩، پــەراوێز*). باســی **بــۆزە** لــە بــارەی پیتــەكانی پەیوەنــدی دا بابــەتێكی سەرنجراكێش دەخاتە روو، كاتێك كــە ئــەو زاراوەی comment (چــۆن) لــە ســەر شكڵی بنەمایی لەگەڵ maniere یەك گیرەكی لكێنراو شیدەكاتەوە تا رستەی Je sais comment la chose se passa (*دەزانم بارودۆخــە كــە چــۆن تێپــەڕی*) مانای (*من دەزانم ئەو حاڵەتەی لــەو بارودۆخــەدا تێپــەڕی بــە چ شــێوەیك بــووە*) هەبیّ، وەیا رستەی (*ئەو خانووەی بوو بەموڵكم*) مانــای (*ئــەو خــانووەی كــە لــەو خانووەدا موڵكایەتییەكەیم بەدەست هێنا*) هەبیّ.

**دۆمارسییە** لەم بوارەدا، لە رێگەی ئەو تیۆرییەی لە بواری **پێكهاتە** و **رستەســازی** دا پێشنیاری كردووە، گۆڕانكارییەكی سەرنجراكێشی وەدی هێنــاوە. ئــەو پێشــنیار دەكا، زاراوەی **پێكهاتە** بۆ رێكخستنی وشەكان لە وتەدا و، زاراوەی **سینتاكس** بــۆ ئەو مانایەی زاراوەكان دەیدەن بەدەستەوە، لەبەرچاو بگرین. بەم پێیە، سیّ رستەی litteras accepi tuas, accepi litteras tuas, tuas accepi litteras سیّ پێكهاتەی جیاواز، بەڵام رستەسازی یەكسانیان هەیە، مانای پەیوەنــدی نێــوان بەشەكانی پێكهاتە لــە هەرســیّ حاڵەتــدا یەكســانە، كەواتــە لــەم ســیّ جــۆرەدا، رێكخستنی یەك مانا هەیە: من نامەی تۆم وەرگرت ئــەو بــەم شــێوەیە پێناســەی سینتاكس دەكات: (*سینتاكس لە هەموو زمانەكاندا هەیە و، دەبێتە هــۆی ئــەوەی زاراوەكان هەر هەمان واتا بدەن بەدەستەوە، كە دەمانەویّ لە زەینی شارەزای ئــەو زمانەدا وەدی بێنین. ل٢٢٩-٢٣١*). ســینتاكی یــەك گــوزارە، لــە راســتیدا هــەر هەمان شتە كە ناومان ناوە **ژێرساز** و پێكهاتەكەی ئەوەیە كە پێی دەڵێن **رووساز**.

چوارچێوەی گشتی کە ئەم جیاوازییەی تێدا وەدی دێ ئەمەیـە، کـە کـردەی زەیـن یەکەیـەکی تەنیایـە. بـۆ منـدالاَن ئـەم هەسـتە کـە شـەکر شـیرنە، (*سـەرەتا تاقیکردنەوەیەکی تەنیاو شی نەکراوەیە*)(ل١٨١). بۆ گەورەکان مانای شەکر شیرنە ئەو بیرکردنەوەی دیخاتە روو هەمان یەکـەی تەنیایـە. زمـان خـاوەنی ئـامرازێکی خۆیەتی بۆ شیکردنەوەی ئەو توخمانەی لە حاڵەتەکانی تریش دا جیاواز نین.

**(زمان) ریگەیەك بۆ رووماڵکردنی بیرو هزری ئێمە، بۆ هەستیار کـردن، بـۆ دابەشـکردن و هەڵوەشاندن و شیکردنەوەی، دێنێتە ئاراوە. بەکورتی میتۆدێکە کە بیری ئێمە بـە جۆرێـك لێدەکا تا بتوانین بە روونی و بە وردەکاری هەرچی زیاترەوە، پەیوەندی لەگەڵ بیرو هزرەکانی ترا پەیدا بکات.**

**کەواتە بیرۆکە تایبەتەکان، هەر کامێکیان کۆمەڵەیەکە، واتـە یـەك گشـت کـە بـە هـۆی بەرهەمهێنانی جیاوازی ئەندامەکانی ئاخاوتن کە زاراوەکان دەخـولقێنن، هاتۆتـە ئـاراوە. ئەرکی زمان ئەم گشتە دابەش دەکـا، هەڵیدەوەشـێنێ، شـیدەکاتەوە، بەشبەشـی دەکـات. (ل١٨٤)**

هەر بەم شێوەیە تێگەیشتنی وتە، بریتییە لە هەڵێنجانی بـیرو هـزری وەك یـەك و لێکجیانەکراوە، لە ریزێك وشە. **زاراوەکان**، بۆ دەرخستنی واتای گشـتی، یـا ئـەو هزرەی دەمانەوێ لە زەینی ئەو کەسەدا وەدی بێنین، کە دەخوێنێتەوە یادەنووسـێ، رکابەری لەگەڵ یەکتر دەکن. (ل١٨٥). بۆ دیاری کردنـی ئـەم هـزرە، دەبـێ زەیـن سەرەتا پەیوەندی نێوان وشەکانی رستە، واتا سینتاکسییەکەی بدۆزێتـەوە، ئینجـا بە پێی ژێرسازەکەی، پەی بە ماناکـەی بـەرێ. زەیـن، میتـۆدی شـیکردنەوەکەی بریتییە، لە پاڵ یەك دانانی ئەو وشانەی پەیوەندییان بە یەکـەوە هەیـە و دەتـوانن

پێرستێکی مانادار بەرهەم بێنن. ڕەنگە ڕستەی سەرەکی خۆی ئەو پێرستە مانادارەی هەبێت، کە لەم حاڵەتەدا پێکهاتەیەکی سادەی (*ئاسایی، زۆرەکی، دیاری کراو، دەربڕاو*) ە. ئەگەر وانەبێ، ئەم **بونیادە مانادارە**[1] دەبێ (*بە هۆی زەینەوە وەدی هاتبێ، کە پەی بە چەمکێك نابا مەگەر واتایەك لەسەر بنەمای نەزم و ڕێخکستن، وەدی هاتبێ. ل١٩١ و ١٩٢* ) بۆ نموونە، بۆ پەی بردن بە ڕستەیەکی زمانی لاتین، دەبێ سەرەتا ئاخێوەر ئەو پێرستە سروشتییە دروست بکا کە لە زەینی دایە. واتە نەك تەنیا مانای وشەکان بزانێ، بەڵکو:

**ئەگەر لە ڕووی زینەوە، ئەو زاراوانە لەبەرچاو بگرین کە پەیوەندییان بە یەکەوە هەیە، لە ڕاستیدا هیچ شتێك لە بابەتەکە ناگەین و ئەمەش کارێکە، ئەنجامدانی مەحاڵە مەگەر ئەو کاتەی گوێبیستی هەموو ڕستەکە بووبین. ٠ل١٩٨و١٩٩)**

بۆنموونە لە زمانی لاتینی دا(*بەندی پەیوەندی ئەوتۆ هەن کە دوای ئەوەی گوزارەکە بە تەواوی بە کۆتا گەیشت، دەبنە هۆی ئەوەی بە پێی پەیوەندیان زاراوەکان و لە ئاکامدا لە سەر پێکهاتەیەکی سادەی **پێویستی**[2] و ماناداریان لە ماناکەیان بگەین. ل١٢٤و ١٢٤* ). ئەم پێکهاتە سادەیە (*نەزمێکە هەمیشە دیاری کراوە، وەلێ بە دەگمەن لە پێکهاتەی باوی ئەو زمانانەدا دەبینرێ، کەلە ناویاندا ناو*

---

[1] -meaningful order

[2]- entailment پەیوەندنی نێوان دوو ڕستە، ڕاستی یەکێکیان ڕاستی ئەوەی تر پشت ڕاست دەکاتەوە. وەك: تیشکی خۆر بەفرکەی تواندەوە ، بەفرەکە توایەوە، کە یەکەمیان ڕاست بیت دووەمیشیان ڕاستە. (درآمدی بر زبانشناسی -ڤیکتۆریا فرامکلین، رابرت رادمنن نینا هیامز ل٦٩٥)

*خاوەنی دۆخە*. ل٢٥١). لێکهەڵوشاندنی رستە بـۆ پێکهاتـەی سـادە، یەکـەمین و گرینگترین هەنگاوی تێگەیشتنی وتەیە:

**زاراوەکان یەك گشت وەدی دێنن، کە خاوەنی چەند بەشێکە. کەواتە تێگەیشتنی سادە لـەو پەیوەندییەی ئەو بەشانە لەگەڵ یەکتردا هەیانە و دەبێتە هۆی ئەوەی کۆی ئەوانە پێکـەوە پەیان پێببەین، تەنیا لە پێکهاتەی سادەوە وەدەست دێ. ئەم پێکهاتە سادەیە، بە خسـتنە رووی زاراوەکان، یا رێکخستنی یەك لە دوای یەکیان و لەسەر بنەمای پەوەندییان، بەروونترین شێوە دەیخاتە بەردەمان و ئەم پەیوەندییانە بە ئێمە دەناسێنێ و دەبێتە هـۆی تێگەیشـتنی تەواو. (ل٢٨٧ و ٢٨٨).**

ئەو پێکهاتانەی سادە نین ، واتە **پێکهاتەی مجازی**[١] **تێگەیشتنیان ناکرێ، لەبەرئەوەی زەین بە یارمەتی بیروبڕوای لاوەکی، کە دەبێتە هۆی پەی بردن بەوەی دەیخوێنینەوە و دەیبیستین، ناریکییەکە راست دەکاتەوە، وەك ئەوەی مانا بە پێی رستەی سادە خرابێتە روو. (ل٢٩٢).**

کورتی وتە ئەمەیە، لە **پێکهاتە سادەکاندا** پەیوەنـدیی **سینتاکسی**، راسـتەوخۆ و بەردەوام لە پەیوەندیی نێوان وشەکاندا رەنگدەداتەوە و، بیری یەکپارچەیی کـە بـە هۆی رستە رادەگەیەنرێ، راستەوخۆ لەو رەنگدانەوە ژێرسازییە وەردەگیرێ، کە بـە خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو زمانەکانیان داناون. (*ئەم بیرۆکەیە بە تایبەتی لەگەڵ رێکخستنی ئاسایی زاراوەکان لە زمانی فەرەنسی دا بە یەکسان دانـراوە. بڕوانـە. ل١٩٣*).

---

1- figurative constructions

ئەو گەردانکردنانـەی پێکهاتـەی **مجـازی** دروسـت دەکـەن، گـەردانکردنی دووبـارە ڕێکخستنەوەی لابردنن. (*بنەمای سەرەکی و گشتی ڕستەسازی*) ئەمە کە دووبـارە ڕێکخستنەوە و لابردنی لە زەینی بیسەردا ئەگەری ئەوە هەیە بەرهەمبێتـەوە (هـ س ل٢٠٢و ٢١٠و ٢١٧) واتە دەتوانین بە مەرجێك ئەمانـە بـەکاربێنین، کـە بتـوانین (*ڕێکخستنی یەکجارەکی و رووتی پێکهاتەی سادە*) بەرهەمبێنینەوە[١].

بـۆ پشـتیوانی ئـەم تیۆرییـە، نموونـەی زۆر لەسـەر بـەش بەشـکردنی ڕسـتە بـۆ (*پێکهاتەی سادە*) هێنراوەتەوە[٢]. لەبەرئەوە (*ڕستەی کێ ئەو بابەتەی بە تـۆ وت؟*) دەگۆڕدرێ بۆ پێکهاتەی سادەی(*لەو ٢٢ کەسەی (نێر یا مێ) کە ئەو بابەتەی بـە تۆ وت کامەیانە؟*) (ساهلین ل٩٣). ڕستەی (*چ دڵبەر بی و چ دڵدار، ناچارت ناکەن فرمێسك بڕێژی*) دەگۆڕێ بۆ ڕستەی (*لەبەرئـەوەی تـۆ دڵبـەری یـا یادڵـدار...*) و ڕستەی (*باشترە بە ویژدان بی نەك دەوڵەمەند، ئاقڵ بی نەك زانا...*) دابەش دەبـێ بۆ چوار گوزارەی ژێرساز، کە دووانیان نەرێنین و دووانەکەی تر ئـەرێنی. (**سـاهلین** ل١٠٩).

---

[١]- لە پێکهاتەکەدا بە تەواوی دیار نییە، کە ئایا ئەم هەل و مەرجانەی لەمەر گەردانکردن، پەیوەنـدییان بـە زمانەوە هەیە یابە گوتارەوە؟ مانای ئەو هەل و مەرجانەی لەمەڕ دەستوور یا کەڵك وەگـرتن لـە دەسـتوورن، هەروەها دیار نییە کە ئایا لەو چوارچێوەی **دومارسییە** پەسندی دەکا، دەکرێ پرسیارێکی ئاوا بکەین یان نا؟ دەتوانین روونکردنەوەی **دومارسییە** لەمەڕ لێکدانەوەی ڕستەکان، لەگەڵ پێشنیارە درەنگ وەختەکانی **کاتیز** و **فۆدۆر** و **پۆسـتاڵ**، بـەراود بکـەین. بڕوانـە: یاداشـتی ژمـارە ٢ **کـاتیز - پۆسـتاڵ** هـەر ئـەو سەرچـاوە و سەرچاوەکانی تر کە ناویان هاتووە.

[٢]- ئەو نموونانەی من لێرەدا هێناومن، **ساهلین** بەناوی دۆخی پەسند نەکراوەی تیوری **دۆمارسییە**، هێنـاونی و دەڵێ: (بۆ ئەوەی هەڵە زۆر روونەکان ئاشکرا بکەین، ناشێ ئەم تیورییە بەرامبەر زانستی نوێ دابنێین. **ساهلین** هـ. س. ل٨٤)

**دۆمارسییە** لە شیکردنەوەکانی خۆیدا (ل۱۷۹ و ۱۸۰) بۆ جیاکردنەوەی **ژێرساز** و **رووساز**، چەند گوزارەی جیاجیای بە نموونە هێنایەوە، وەك (*من رایەکم هەیە، من دەترسم*) لە رووی دروست کردن لە زمانی فەرەنسی دا (*من ترسەکەمم هەیە*). (*من گومانم هەیە*) و هیتر. ئەو دەڵێ ناتوانین ئەم گوزارانە کە بەڕواڵەت وەك یەکن (*من کتێبێکم هەیە، من ئەڵماسێکم هەیە، من کاتژمێرێکی دەستیم هەیە*) و ناوکانیان ناوی شتومەکی راستەقینەن کە سەربەخۆ لە هزری ئێمەدا بابەتین، لەگەڵ گوزارەکانی تر بە یەکسان بزانین. بە پێچەوانەوە، کار لە رستەی (*من رایەکم هەیە*)دا زاراوەیەکی وەرگیراوە کە لەسەر بنەمای لاسایی دروست کراوە. مانای من رایەکم هەیە لە راستیدا ئەمەیە کە (*من بیردەکەمەوە، من بەم شێوە یا ئەو شێوەیە بیردەکەمەوە، من تێدەگەم و پەی پێدەبەم*). لەبەرئەوە دەستووری زمان هیچ مۆڵەتێك نادات بە ئێمە تا وا بیربکەینەوە زاراوەی وەك **رامواییە**، **تێدەگەم** و **پەی پێدەبەم**، جێگەی شتومەکی راستەقینە بگرنەوە، چ بگا بە (*زیندەوەری بەرچاو*). ئەم لێکدانەوە دەستوورییە، لەگەڵ رەخنە گرتن لە تیوری وێنە زەینییەکان، بە شێوەی دیکارتیی و ئەزموونگەرا، کە لەسەر بنەمای پێوانەکای دەستووری هەڵە بنیاتنراون، ئەوەندە لێك دوور نین. کەمێك دواتر **تۆماس رید** ئەم ماوە کورتەی نێوانیشیانی لابرد[١].

هەر بەو شێوەی **دۆمارسییە** بە گەلێك نموونە شرۆڤەی کردووە، تیوری سینتاکسی یا رستەسازی و پێکهاتەکەی، پێش ئەویش لە دەستوورەکانی قۆناغی **سکۆلاستك** و **رنسانس** دا هاتبوون (بڕوانە پەراوێزی ل٧٦ ژ٢). وەلێ ئەو پاشکۆی پەیڕەوانی دەستووری پۆرت رۆیاڵ بوو، لە راستیدا **تیوری ژێرساز** و **رووسازی**، بە تیورییەکی

[١] واتە ئەو جیاوازییەی نێوانیانی نەهێشت.

دەروونناسی دەزانی، نەك ئامرازێك بۆ روونكردنەوەی چەند **شێوەیەكی دیاری** كراو یا شیكردنەوەی **دەق**. هەروەك وتمان، ئەم تیوریییە رۆڵێكی لە روونكردنەوەی گریمانەیی ناوبراو لەمەڕ وەرگرتن و بەرهەمهێنانی وتەدا هەیە، راست وەك ئەوەی لە **دەستووری پۆرترۆیاڵ** دا هاتووە، كە ژێرساز هەر بەو شێوازەی وتە دەبیسرێ یا بەرهەم دێ، لە زەین دا دووبارە رەنگ دەداتەوە.

وەك دوایین نموونە، لە بواری هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی ئەو رێسامەندییانەی، لە ئاستی ژێرەوەی فرەجۆری دا خۆیان شاردۆتەوە، دەتوانین لە **بەشی حەوتەمی** كتێبی دەستووری پۆرت رۆیاڵ، شیكردنەوەی پێتەكانی پێناسەی **نكرە،** بكەین بە بەڵگە. لەوێدا كە لەسەر بنەمای بەراوردی نموونەیی des , de هەمان رۆڵی un ئامرازی كۆ دەبینن. بۆ نموونە رستەی ( un crime si horrible merite la mort، تاوانگەلی ئاوا كارەساتبار سزاكەی مەرگە) وە رستەی ( des crimes si horrible meritent la mort , de si horribles crimes meritent la mort تاوانگەلی كارەساتباری ئاوا سزاكەیان مەرگە، تاوانگەلی ئا ئاوا كارەستبار سزاكەیان مەرگە) لەبەر چاو بگرن. بۆ روونكردنەوەی ناوازەی ئاشكرا كە لە رستەی (il est coupable de crimr horribles (d horrible crime ئەو تاوانی كارەستباری ئەنجام داوە (*تاوانی كارەساتبار*) هەیە، دەڵێن كە **رێسای ناهەمنەوایی**[1] رێكخستنی de de دەخاتە جێگەی de. بەڵام ئەوان هاوكات لە كاریگەری des، وەك دەركەوتنی پێتی پێناسەی مەعریفە وكاریگەرییەكانی تری ئەم وێنانە، ئاگادارن.

بە ئەگەری زۆر ئەم خاڵانە و ئەم نموونانە، بۆ پێشنیاری حاڵەتی هاونومایش و هاوشێوەی تێورییەكانی دەستووری و پەیڕەوانی دەستووری فەلسەفی، بەسن.

---

[1] –cacophony rule of

هــەروەك لەســەرەوە وتمــان، تیــوری **ژێرســاز** و **رووســاز** هــەردووكیان، راســتەوخۆ پەیوەندییان بە پرسی داهێنەرانەی كەڵك وەرگـرتن لـە زمـان، هەیـە. ئـەم خاڵـە لەبەشی یەكەمی ئەم كتێبەدا كەوتۆتە بەرباس.

لە روانگەی زمانناسی نوێوە، ئەم هەوڵە بـۆ دۆزینــەوە و رەتكردنــەوەی ژێرســاز و رووساز و تاوتوێكردنی رێساكانی گـەردانكردن، كـە بـە شـێوەی رووسـاز دەریـان دەخەن تارادەیەك بێ مانان*.[1] چونكە بایەخ نـەدان بـە **زمـانی واقعـی (شـێوەی رووساز)**، نیشانەی گوێنەدانە بە **(دیفاكتۆی زمان)**. رخنەگەلی ئاوا لەسەر بنەمای سنوردار كردنی پانتایی **دیفاكتۆی زمان**ە، بـە بەشـەكانی دیـار و بەرچـاو و وتـە راســتە قینــەكان و ئــەو پەیوەندییــە رواڵــەتی و دیــاری كراوانــەی ئــەوان[2].

---

* خوێنەر ئاگادارە كە مەبەستی چۆمسكی لێرەدا زمانناسی پێكهاتەگەرایە Stractural linguistic).

[1]- جگە لەوەی لەو نموونەی دوایی دا، واتە شـیكردنەوەی پیتـی پێناسـە تارادەیـەك نادیـار نیشـان دەدرێ، تیۆرییە نوێیە زمانییەكان، بۆ تێپەڕین لە سنووری **شكلی رواڵەتی** ، ئەم هەوڵانە بە رێگە پێدراو دەزانن. ئەم هەوڵانە باس و خواسی زۆری میتۆدناسی بوون، بە تایبەتی لە ئەمەریكا لە دەهەی ١٩٤٠ دا.

[2]- بۆ لێكۆڵینەوەی پتر لە بواری میتۆدەكانی هاوچـەرخ لـە رستەسـازی دا، كـە ئـەم سـنووردارییە پەسـند دەكات، بڕوانە:

Postal, Constituent Stracture. The Hague Mouton (1964)

جگەلەوە زۆر باسی میتۆدناسی نوێ، لە راستیدا ئەوە دەگەیەنن، كە تاوتوێكردنی زمـانیی، دەبـێ تایبـەت بێ بە رووسازی وتەكان لە جەستەیەكی نەگۆڕدا. لەبەر ئەوە **ساهلین** (ل٣٦) كە بـەهۆی كـەڵك وەرگـرتن لـەو نموونە ساختانە لەبری نموونەی تایبەت بە گوتارەكان، كە بەراستی لە زمـانی زینـدوودا بینـراون، رەخنـە لـە دۆمارسییە دەگرێ و (بە هەڵەیەكی نالێبوردەی دەستوورزانێك)ی دەزانێ، لە راستیدا رەنگدانـەوەی روانگـە نوێیەكانە دیارە بە بۆچوونی سـاهلین، رێگـەی لـۆجیكی هـەمان كـەڵك وەرگرتنـە لـە گوتـاری واقعـی. بـۆ بەدواداچوونی پتر لە مەڕ گرفتەكانی **ژێرساز** و **رووساز** بڕوانە:

Chomsky, Syntatic Stractures, The Hague, Mouton (1957) Current Issues in Linguistic Theory, Aspects of The Theory of Syntax; Lees Grammer of English Nominalizatins, The Hauge Mouton (1960); Postal "Underlying Superficial

لێکۆڵینەوەکانی زمانناسی کە بەم شێوەیە سنووردار کرابن، تەنیا ئەو کۆمەڵە کاریگەرییانەی زمان بۆ خستنە رووی هزر تاوتوێ دەکەن، کە ژێرساز و رووسازییان بە رێکەوت یەکسان بێت. ئەم زمانناسییە بە شێوەیەکی دیاری کراو، پەیوەندییەکانی **دەنگسازی - مانا** کە لە رووسازدا دەردەکەون، تاوتوێ دەکات، هەر لەبەر ئەم سنووردارکردنەیە، کە زمانناسی دیکارتی و لێکۆڵینەوە زمانییەکانی رابردوو بایەخیان پێ نادرێ، کە هەرچۆنێك بێ سەرنجیان راکێشاوە بۆ ژێرساز (*تەنانەت ئەو کاتەی کە ژێرساز بە شێوەی دیاریکراو و زاراوە بە زاراوە لەگەڵ نیشانە دیارەکانی گوتاردا هاورێك نین*)[1] . دیارە ئەم هەوڵە نەریتیانە کە رێکخستنی ناوەرۆکی مانایی و رێکخستنی دەنگسازی ئەنجامدرا، لە زۆر رووەوە ناتەواو بوو، وەلێ رەخنەی نوێ، بەگشتی لە بۆچوونەکانیان نەك کەموکورییەکانیان، ئەوانە رەت دەکاتەوە.

---

Linguistic Stractures, Harvard Educational Review, 34, (1964) : Katz & Postal, An Integrated Thoery of Linguistic Description: Katz, The Philosophy of Language.

[1]- تەنیا یەك نموونە دێنمەوە، بە وردی سەیری رستەی سەرەتایی **ئارنۆڵد** بکەن لە لێکدانەوەی **دەستووری فەلسەفی** (هـ .س ل١٨ ، پێویستە جەخت بکرێتەوە لەسەر ئەوەی ئەم باسە نائاساییە، چونکە تەنیا بایەخ بەو زانیارییانە دەدات، کە پەیڕەوانی دەستووری فەلسەفی بڕوایان پێیەتی و، ئەو بیروڕایە پوچەڵانەی کە بەتەواوی پێچەوانەی راو بۆچوونی ئەوانە، بە راوبۆچوونی ئەوانی لەقەڵەم نادا). ئەو دەڵێ نووسەرانی ئەم بەرهەمانە هەستیان دەکرد (یارمەتی زانستێك دەدەن، کە پێش ئەمە کاریگەرییەکی گرینگی هەبووە، مانای دەوڵەمەندکردنی میراتی ئێستا و پەرەپێدانی ئەو دەرئەنجامانەی، کە تا ئێستا دەستەبەر کراون. رەنگە ئەم بڕوایە لە زمانناسی دا جێگای پێکەنین بێ، بەڵام دیفاکتۆیەکە و راستە.)
پێویستە ئاگادار بین کە شێواوی نوێی تیوری نەریتی زمانناسی، نەك تەنیا لەم دیفاکتۆیەوە سەرچاوە دەگرێ، کە ئەم تیورییە هەموو سەرنجی خۆی ئاڕاستەی **رووساز** کردووە، بەڵکو لە قبوڵ کردنی بێ رەخنەی، لێکدانەوەی رەفتارگەرایانەی ئەرك و فێربوونی زامانەوە، هاتووە،، لێکدانەوەیەك کە بنەماکەی لە چەندین بواری زانستی تردا باوی هەیە و بە رای من لە ئەفسانەیەك بەولاوە چیتر نییە.

# لێکدانەوە و روونکردنەوە لە زمانناسی دا

لە چوارچێوەی زمانناسی دیکارتی دا، **دەستووری لێکدانەوەیی**[1] هەم باسی مانا دەکات هەم دەنگ. بە لێکدانەوەیەکی تر، ئەم دەستوورە بۆ هەر رستەیەك، ژێرسازێکی ئەبستراکت و رووسازێك دیاری دەکا. ژێرساز، ناوەرۆکی مانایی رستە دیاری دەکات و، رووساز شێوەی دەنگسازی رستە. کەواتە دەستووری تەواو، سیستمی کۆمەڵە یاسایەکی دیاریکراو لە خۆ دەگرێ، کە کۆمەڵێکی بێ سنوور پێکهاتەی دوولایەنی ئاوا بەرهەمدێنێ و لە ئاکامدا نیشانی دەدات، کە چۆن ئاخێوەر - بیسەر دەتوانێ بۆ دەربڕینی کردەی زەینی و بارودۆخی زەینی خۆی، کەڵك بێ سنوور لە چەند ئامرازێکی دیاریکراو وەربگرێ.

وەلێ زمانناسی دیکارتی تەنیا بریتی نەبوو لە **دەستووری لێکدانەوەیی** ئەم چەمکە، بەڵکو **دەستووری گشتی** واتە بنەما هاوبەشەکانی پێکهاتەی زمانیش دەگرێتەوە. ئەم زمانناسییە هەر لە سەرەتاوە جیاوازی دانا لە نێوان **دەستووری تایبەتی** و **دەستووری گشتی**. دۆمارسییە ئاوا باسی ئەم جیاکردنەوەیە دەکات:

**لەم دەستوورەدا چەند خاڵێك هەیە، کە لەگەڵ تێکڕای زمانەکان هاورێکە، ئەوەی ئەم خاڵانە وەدی دێنێ، ئەمەیە کە پێدەڵێین دەستووری هاوبەشی گشتی زمان: ئەم خاڵانە چەند راستییەکن لەمەر ئەو دەنگانانەی بەرهەم هاتوون، ئەو پیتانەی هێمای دەنگن، چییەتی زاراوەکان و ئەو شێوە جیاوازانەی کە دەبێ هەبن، یا رێکخرابن، یا بۆ گەیاندنی واتا دیاری**

---

[1] - Descriptive Grammer دەستووری توسیفی، کە بریتییە لە باس یا لێکدانەوەی زمانناس، بۆ دەستووری زەینی، کە یەکەی رستەسازی، پێکهاتە و رێساکان دەگرێتەوە. لێکدانەوەیەکی راست و رەوانی ئاخێوەرانە، لەبارەی زمانەکەی خۆیاندا.

**کرابن. وێڕای ئەم خاڵە گشتییانە، چەند خاڵی تر هەن کە تایبەتن بە زمانێکی تایبەت، ئەمەش ئەو بابەتانەن، کە دستووری تایبەتی هەر زمانێك بەرهەم دێنن[1].**

**بۆزە** ئەم جیاوازییە بەم شێوەی خوارەوە شرۆڤە دەکات:

**لەسەر ئەم بنەمایە، دەستووری زمان، کە ئامانجەکەی دەستەبەرکردنی وێنەیەکی هزرە، کە بە یارمەتی وتە هاتۆتە سەر زمان یا نووسراوە، دوو بنەما بە رێگە پێدراو دەزانێ، یەکێك لەو دووانە، جۆری راستییەکی نەگۆڕە و کاریگەرییەکەی جیهانییە. ئەم بنەمایانە پەیوەندییان بە بیرکردنەوەوە هەیە و بیرکردنەوە بەش بەش و شیدەکەنەوە، لە دەرئەنجامەکەی بەولاوە شتێکی تر نین، ئەو جۆرەی تری بنەماکان، شتێك نین جگە لە دیفاکتۆی گریمانە کراو و پەیوەست بە پەیمانی گریبەستی و بە ئارەزووەکان، کە گۆڕانهەڵگرن. وەدی هاتنی زمانی جۆراوجۆر، لەم بنەمایانەوە سەرهەڵدەدەن. بنەماکانی جۆری یەکەم، دەستووری هاوبەشی گشتی زمان بەرهەم دێنن و بنەماکانی جۆری دووەم، بابەتی جۆراوجۆری دەستووری زمانە تایبەتەکانن. لەبەر ئەوە دەستووری هاوبەشی گشتی زمان، مەعریفەی ئەقلانی بنەما نەگۆڕەکان و گشتی زمانی گوفتاری یا نووسینن، ئیتر لە هەر زمانێك دا و بە هەر شێوەیەك بێت.**

---

[1] - (1729) Veritables Primcipes de la grammair بە وتەی **ساهلین** ه. س. ل٢٩ و ٣٠ میژووی ئەم بەرهەمە لە پێشەکییەکەیدا لە لاپەڕە ٩ دا هاتووە. **ئارنوا** ماوەیەکی زۆر لەمەوبەر وتبووی کە (ئێمە عادەتمان وانییە، ئەو شتانەی لە نێوان هەموو زمانەکاندا هاوبەشە، لە دەستووری تایبەتی زماندا بیخەینە روو. بە وەرگرتن لە **سان بۆڤ** ل٥٣٨ ١٦٦٩) و جیاوازی نێوان **دەستووری هاوبەشی گشتی** و **دەستووری تایبەتی**، لە **دەستووری پۆرت رۆیاڵ** دا هەرچەند بە باشی روون نەکراوەتەوە، وەلێ بە شێوەیەکی شاراوە بوونی هەیە. **ویلکنیزیش** جیاوازی داناوە لە نێوان، **دەستووری سروشتی** (واتە **فەلسەفی، ئەقلانی، هاوبەش** کە پەیوەستن بە زەمینە و ئەو رێسایانەی بێ گومان پەیوەندیان بە فەلسەفە و ئەدەب و گوتەزاوە هەیە) و دەستووری تایبەتی یا بە **ئۆرگانکراو** کە پەیوەندی بە (یاساگەلی تایبەتی یەك زمانی دیاری کراو وە هەیە (ه. س.ل٢٩٧).

دەستووری تایبەتی زمان، هونەری بەکارهێنانی بنەما نەگۆڕ و گشتی زمانی گوفتاری یا نووسینە، لە ئۆرگانە باو و بە ئارەزووەکانی زمانێکی تایبەتدا.

دەستووری گشتی زمان، جۆرێکە لە مەعریفە، چونکە تاوتوی کردنی بنەما نەگۆڕ و گشتییەکانی زمان نەبێ، ئامانجێکی نییە. بەڵام دەستوری زمانی تایبەت جۆرێکە لە هونەر، چونکە کەڵك وەرگرتنی پراکتیکی لە ئۆرگانە باو و بە ئارەزووەکانی زمانێکی تایبەت، بە پێی بنەما گشتیەکان هەڵدەسەنگێنێ.

مەعریفەی دەستووری لە پێش هەموو زمانەکانەوەیە، چونکە ئەگەر بوونی زمانەکان نەبێ، بۆ بنەماکانی مەعریفەی دەستووری، شتێکی تر پێویست نییە، هەر ئەو بنەمایانە بۆ کاری هۆشمەندانە و زەینیش، ڕێنوێنی ئەقڵی مرۆڤ دەکەن. بە کورتی ئەمەیە کە ئەم بنەمایانە لە دیفاکتۆیەکی جێگیر هەڵقولاون.

بە پێچەوانەوە، هونەر دەستوورێکی درەنگی زمانەکانە، چونکە پێش ئەوەی بە شێوەی ساختە لەگەڵ بنەماگشتییەکانی زمان پێکیان بگرین، دەبێ کاریگەری زمانەکان بوونیان هەبێ، هەروەها سیستمەکانی پێوانەیی کە ئەم هونەرەیان هێناوەتە ئاراوە، شتێك نین جگە لە دەرئەنجامی ئەو بینینانەی بە پشت بەستن بە کاریگەرییکانی پێشوو هەبوون.

**دالامبیر** لەمەڕ ستایشی **دۆمارسییە**، لە (دەستووری فەلسەفی) دا ئاوا دەڵێ:

لەبەر ئەوە، دەستووری زمان، دروستکراو و ڕێکخراوی فەیلەسوفەکانە، زەینی فەلسەفی تەنیا دەتوانێ تا سنووری ئەو بنەمایانە بڕیکات، کە ڕێساکانیان لەسەر دامەزراوە... ئەم زەینگەراییە، سەرەتا لە دەستووری هەر زمانێکدا، ئەو بنەما گشتییانە دیاری دەکات، کە لە هەموو زمانەکانی ترا هاوبەشن و دەستووری گشتی پێکدێنن، دواتر کاریکەری تایبەتی هەرزمانێك نیشان دەدات. ئەو کاریگەرییانەی کە لە سەر پایەی ئەقڵمەندین، لەو کاریگەرییانە دادەبڕێن کە جگە لە کاریگەری ڕێکەوت و هەڵە شتێکی تر نین: ئەم زەینگەراییە، کاریگەری زمانەکان نیشان دەدا لەسەر یەکتر، هەروەها ئەو گۆڕانگارییانەی -

**بێ ئەوەی تایبەتمەندی ئەو زمانانە بە تەواوی لەناوببا - ئەم تێکەڵاوییەی لێکەوتۆتەوە. ئەم زەینگەراییە، ئیمتیاز و کەموکوڕی زمانەکان، جیاوازی لە پێکهاتنیان دا، فرەجۆری لە تایبەتمەندی خۆیان... دەوڵەمەندی، سەربەخۆیی، لاوازی و گەورەییان هاوسەنگ دەکات. پەرەسەندنی ئەم بابەتە جیاوازانە، میتافیزیکی راستەقینەی زمانە. بابەتی ئەم دەستوورە، میتۆدێکە کە زەینی مرۆڤ بەکاری دێنێ بۆ، خولقاندنی بیر و هزر، بڕواکانی خۆی، هەروەها کاریگەری زاراوەکان بۆ گواستنەوەی بیروراکان بۆ ئەوانی تر[1].**

دۆزینەوەی بنەما گشتیەکان، دەتوانی باسێکی سنوورداری راستەقینەی زمانەکان، بدا بەدەستەوە، تا ئەو جێگایەی کە دەتوانین نیشانی بدەین، ئەوانە واتە بنەما گشتییەکان، چەندین نموونەی دیاریکراون لە خەسڵەتە گشتییەکانی پێکهاتەی زمان، کە لە **دەستووری هاوبەشی گشتی**[2] دا باسکراون. جگە لەمە، دەتوانین خودی ئەو خەسلەتە هاوبەشە گشتییانە ، لەسەر بنەمای گریمانە گشتییەکان لەمەڕ پرۆسە زەینییەکانی مرۆڤ، یا توانای کاریگەری زمان (*وەك کەڵك وەرگرتن لە گەردانکردنی لابردن*)، روون بکەینەوە. زمانناسی دیکارتی هەوڵ دەدات دەستوورێك بێنێتە ئاراوە، کە نەك هەر **گشتی** بەڵکو **لۆجیك**یش بێت.

زمانناسی پۆرت رۆیاڵ و ئەوانەی دوای ئەو، تا رادەیەك لە کاردانەوە بەرامبەر مێتۆدی زاڵی چەند کتێبی وەك **چەند تێبینی لەبورای زمانی فەرەنسی** دا (١٦٤٧) نووسینی **ڤیجلاس**، نووسراون. ئامانجی **ڤیجلاس** تەنیا باسکردنی کاریگەری زمانە، ئەو کاریگەرییەی (کە هەمووان دەزانن فەرمانڕەوای زمانە

[1]- بە وەرگرتن لە **ساهلین** هـ، س، ل٢١، جیاوازی هەیە لە نێوان جەخت کردنەوەکان و وتەکانی **بۆزە** و **دلامبیر** لە بواری پەیوەندی نێوان واقعیاتی تایبەتی و بنەم گشتییەکان. بەڵام ئەم دوو رایە دژپێك نین.

[2]- Universal Grammer وەلێ لە دەقە ئینگلیزییەکەشدا بە زمانی فەرەنسی grammaire générale.

زیندووەکانە. پیشەکی). کتێبی ناوبراو کە ناوی **چەند تێبینیەك لە بواری زمـانی فەرنسی دا،** نەك بڕیارەکان...یا یاساکان...، چونکە ئەو کەسێکە تـەواو توێـژەر. ئەو نالێ دەیەوێ واقعی گوتار روون بکاتەوە، یا رێسا گشتییەکان بدۆزێتـەوە کـە ژێرخانی گوتارن. ئەو لەبەر چەند بەڵگەی لۆجیکی یا هەستیاری، هەرگیز پێشنیار ناکات گۆڕانکاری یا **پاکسازی** لە زماندا بکـرێ. کەواتـە دەسـتووری نـاوبراو نـە لۆجیکی و نە مۆڵەت پێدراوە[1]. ئەو لە پرسەکانی دیاری کردنی کارایی بە تـەواوی ئاگادارە و باسێکی جـوانی لەمـەڕ **میتۆدەکـانی هـەڵێنجان**[2] (ل۵۰۳ بـە دواوە) هەیە، کە لە وێدا ئاماژە دەکات بـە ناتـەواوی جۆرەهـا تاقیکردنـەوەی **پرسـینی راستەوخۆ** بۆ دەستووری بوون، کە زۆرجار بە هـۆی **زماننـاسـانی پێکهاتەگـەراوە** پێشنیار کراوە و بەکار هێنراوە وئامانجی نادیاری هەبووە. ئەو باسەکەی خـۆی بـە رووساز سنووردار ناکات[3]. بۆنموونە، ئـەو وەبیرمـان دێنێتـەوە کـە ئێمـە نـاتوانین سیمای زاراوەکە بزانین، کە ئایا زاراوەکە **واتای دیارە** یا **نادیار**، یا بـە شـێوەیەکی ناروون هەردوو واتاکەی هەیە. لەبەرئەوە لە رستەی (*رێزی من تا ئەو رادەیە نییـە کە ئێوە بتوانن کەڵکی لێوەربگرن*) گوزارەی (رێزی مـن) واتای (*ئەو رێـزەی مـن بـۆ ئێوە دادەنێم*) هەیە، لە کاتێکدا رستەی (*رێزی من پەیوەندی بە ئێوەوە نییـە*) بـە

---

[1]- بە دڵنیاییەوە جۆرێك لە توخمی شاراوە بەناوی (**تجویزی**، راسپاردە یا مۆڵەت پێدراو) لە هەڵبژاردندا هەیە، مەبەست هەڵبژاردنی زمانی بلیمەتانە (واتە کارایی باشترین نووسەران و بە تایبەتی **کارایی زمانی دەرباری)** وەك بابەتێکی لێکدانەوە.

[2]- Elicitation procedures

[3]- دەبێ بزانین، سنووردار کردنی لێکۆڵینەوە زمانییەکان بە لێکدانـەوەی بـێ روون کردنـەوە، پێویسـتی بـە سنوورداربوونی هاوشێوە نییە لە تاوتوێ کردنی **رووسازدا**، ئەم سـنووردارکردنەی دوایـی، سـنووردارکردنێکی نوێی و سەربەخۆیە.

مانی (*ئەو رێزەیە من بۆخۆمی دادەنێم یا ئەو بەهایەی دەکرێ بۆ منی دابنێین*) هەر ئەم خاڵە لەبارەی وشەی وەك **یارمەتی، هاوکاری،** و **بڕوا**دا راستە. نموونەی تریش لەبارەی بەس بوونی **لێکدانەوەیی** لە پانتاییەکی تردا. هاوکات کارەکانی **ڤیجلاس** زۆربەی کەموکورییەکانی تیوری نوێی زمانناسی گرتەوە، وەك نەدۆزینەوەی لایەنی داهێنەرانەی کەڵك وەرگرتن لە زمان. بەم پێیە، ئەو، پێی وایە کەڵك وەرگرتنی ئاسایی لە زمان، ئەو گوزارە و رستانە دەگرێتەوە کە لە گاریگەری مانادا دەدۆزرێنەوە. هەرچەندە ئەو بڕوای وایە دەتوانین زاراوەی نوێش وەك (pleuremrnt , brusquete) لە سەر بنەمای پێوانەیی دروست بکەین.(ل ٥٦٨ بە دواوە). بەم پێیە بۆچونی ئەو دەربارەی پێکهاتەی زمان لەگەڵ رایەکانی **سۆسۆر**، **یسپرسن**، **بلۆمفیلد** و زۆری تر، جیاوازییەکی ئەوتۆیان نییە، کە لای ئەوان داهێنان تەنیا لەسەر **بەراوردکاری**[1] و لەسەر بنەمای جێگیر کردنی چەند زاراوەی یەك وتە، لە چوارچێوەیەکی نەگۆڕدا، ئەگەری بوونی دەبێ. (بڕوانە ل٣١و٣٢).

**دەستووری فەلسەفی** دژی لێکدانەوەگەرایی[2] **ڤیجلاس** و ئەوانی تر کاردانەوەیان نییە[3]. بەڵکو دژی سنوردارکردنی دەستوورە بە لێکدانەوەگەرایی رووت.

---

[1]- analogy

[2]- descriptivism

[3]- **ڤیجلاس** یەکەمین کەس نییە کە جەخت لەسەر پێشەنگی کارایی دەکاتەوە. سەدەیەك پێش ئەو لە یەکێك لە دەستوورەکانی زمانی فەرنسی دا، **میگرە** دەڵێت: (پێویستە چۆن دەدوێین ئاوا بدوێین) و (مەحاڵە بڕیار لەسەر هیچ رێساو یاسایەك دژی کەڵك وەرگرتن لە فۆنیتیکی زمانی فەرەنس، بدرێت). لە زمان **لیڤە** و لە کتێبی: La grammair francaise et les grammriens du xvI siecle. سەیرەکە ئەوەیە، کاردانەوەی زمانناسی دیکارتی بەرامبەر لێکدانەوەگەرایی رووت دادەنێ، گەشەکردنی دەستووری تیوری سەدەی سێزدەهەم بە هەوڵێك دەزانێ، تا روون کردنەوەی ئەقڵانی لە بری تۆمار کردنی زمان و کارایەکەی

راسپاردەی هەمیشەیی دەستووری پۆرت رۆیالْ بۆ ئەو کەسانەی لە سەر زمانە زیندووەکانی دنیا کاردەکەن ئەمەیە: (*شێوەکانی وتەبێژی کە پاشکۆی کاریگەری گشتی و پوچەڵنەکراوەن، تەنانەت ئەگەر لەگەلْ رێساکان و دەوڵەمەند کردنی زمانیش بن، پێویستە بە راست دابنرێن. ل٨٣*). **لامی** لەوتارەکەیدا لەمەڕ باسی کاریگەری زمان، هەمان بۆچوونی **ڤیجلاس** دووبارە دەکاتەوە، بەو مانایەی کە کاریگەری (*فەرمانڕەوا و حاکمی رەهای زمانەکانە*). ئەو بڕوای وایە، (*هیچ کەس دژی ئەو فەرمانڕەواییە نییە، کە پێداویستی دەیسەپێنێ و رەزامەندی گشتی تاکەکانیشی لەسەرە. ھ س ل٣١*).

**دۆمارسییە** جەخت دەکاتەوە کە (فەیلەسوفی دەستووریی، کاتێك لێکدانەوە بۆ خاڵێکی زمانێکی تایبەت دەکات، پێویستە گرینگی ئەو خاڵە بۆ زمان لەبەرچاو بگرێ، نەك بایەخ بە پەیوەندی ئەو زمانە بدات لەگەلْ زمانێکی تر[1]. کەواتە تایبەتمەندی دیاری دەستووری فەلسەفی، ئەمە نەبوو کە بیەوێ زمان پوختە و

---

بێتە دی. دەستووری تیوری جیاوازی دادەنێ لە نێوان دەستووری گشتی و دەستووری تایبەتی. بۆ نموونە راجێر بیکن گریمانەی دەکرد کە (دەستوور بە پێی خودی خۆی لە هەموو زمانەکاندا یەکسانە، هەرچەندە بە رێکەوت دەگۆڕدرێ)

Grammatica Greaca, edited by Charles, p278. cited in N. Kertizmann, "History of Semantics" in Encyclopedia of philosophy.

[1]- لە زمانی **ساهلین**ەوە (هـ. س. ل١٦) لە وتاری **حالْەتی بەرکاری** لەو زانستنامەی سەرەوەدا، ساهلین وتەیەکی ئاوای (Veritables principes) بە نموونە دێنێتەوە: (دەستووری زمان پێشەنگی بوونی زمانەکانە، هیچ زمانێك نییە لە سەر بنەمای دەستووری زمان دروستکرابێ، پێویستە بینینەکانی دەستوورنووسان لەسەر بنەمای کارایی زمان بێ، چونکە هیچ یاسایەك نییە، کە لە پێش ئەم کاراییەی زمانەوەبێ) دوابەدوای ئەم وتەیە هاتووە کە دەلێ: **دۆمارسییە** خۆی لەگەلْ ئەم پرنسیپە نەبوو. هەرچەندە لە کارەکانی دا زۆر بابەتی بۆ رەخنە لێگرتن هەیە، بەلاّم بەلْگەیەکی ئەو تۆم دژی ئەم بانگەشەیە دەسنەکەوت.

پاکسازی بکات، بەڵکو دەیەویست ڕێسا بنەماییەکانی بدۆزێتەوە و ئـەو دیاردانـە ڕوون بکاتەوە کە دەیانبینێ.[1]

ئەو نموونانەی کە بە درێژایی یەك سەدە، بـۆ نیشـاندانی **دەسـتووری لێکدانـەوە** و **دەستووری ڕوونکردنەوە**[2] بەکار دەهێنرا، **ڤیجلاس** پێشکەشـی کردبـوون. (ل٣٨٥ بەدواوە). ئەم نموونانە لە بارەی **گیرەکە لێکنراوەکان**[3]، بە تایبەتی ئاماژەیـان بـەم یاسایە دەکرد کە ناتوانین گیرەکی لێکنراو بە ناوەوە بلکێـنین کـە پیتـی پێناسـەی نییە، یا تەنیا (پیتی نەکیرە)ی de هەیە. لەسەر ئەم بنەمایە ناتوانین بڵـێین (ئـەو ئەم کارە لەرووی پیسکەییەوە ئەنجام دەدا، چونکە دەتوانێ هەرکارێك بکا( il fait clea par avarice qui est capable de tout) یا (ئەو ئەم کارەی لە ڕووی پیسـکەییەوە ئـەنجام دا، چـونکە تینویـەتی نەدەشـکا il a fait clea par avarice, don’t la soif ne se peut) هەر لەبەر ئەم هۆیە گوزارەی (ئەو لە ئەنجامی بەرکەوتنی گوللەیەك بریندار بوو کە ژەهراوی بوو il a este blesse d un coup de fleche, qui estoit empoisonnee) نـاتوانن بـەکاربێنین، هەرچەندە گوزارەکانی (*ئەو بە گوللەیەك بریندار بوو کە ژەهراوی بوو*) یا (*ئەو بـە گوللەیەك کە ژەهراوی بریندار بوو*) ڕاستن.

---

[1] - ئاشکرایە ئەم کارە هاوئاهەنگە لەگەڵ میتۆدی زمانناسی دیکارتی، کە جەخت دەکاتەوە لەسەر پێویسـت بوونی تاقیکردنەوە بۆ هەڵبژاردن. بڕوانە **گوفتار لە میتۆد دا** بەشی شەشەم، شوێنگەکانی سەرنجی دیکـارتی بۆ دەستووری گشتی کە (ئەوشتانە دەخاتە ڕوو کە لە مرۆڤەکاندا هاوبەشە) و (دەستووری لۆجیکی) کە تەنیا لە بری ژماردنی کارە هەنوکەییەکان دەریان دەخـا، لـەوە ڕوونـترە پێویسـتی بـە لێکۆڵینـەوەی ورد هـەبێ. هەڵێنجانی ئەرستۆییانە لە زانستە ئەقڵییەکان، کە بەم دواییانە دووبارە بایەخیان پێدراوەتەوە، هەر بەم پێیـە دەستووری تیوری سەدەی نۆزدەهەمی لێکەوتەوە. بڕوانە ن. **کرتزمان**. هە. س.

[2] -descriptive and explanatory grammar

[3] -Risteicted Bounds

بەشی نۆهەمی **دەستووری پۆرت رۆیاڵ**، سەرەتا باسی جۆرەها شتی ناوازەی ئـەم ڕێسایه و دواتر بنەمای گشتی پێشنیار دەکات، کە هـەم نموونـەکانی **ڤـیجلاس** و هەم ناوازەکانی ئەو ڕێسایه روون دەکاتەوە[1] . جارێکی تر پاساوەکە لەسەر بنـەمای مانا و دەلالەتە. لە مەڕ **ناوی گشتی**[2] ماناکە نەگۆڕە (تەنیا لە باری نـاروونی یـا خوازەدا) نەبێ، بەڵام پانتایی بە ستراوە بە کۆمەڵەیەکی ناویی کە دەرکەوتووە کار لەوێدا جیاوازە. دەرکەوتنێکی تایبەتی نـاو بـە **نادیـار**[3] ناودەبـەن: (*ئەگـەر هـیچ نیشانەیەك نەبێت، کە دەریبخا ئەم ناوە بە گشتی بە شێوەیەکی تایبەتی لەبەرچاو گـیراوە، هـەروەها ئەگـەر ناوێـك بـە شـێوەی تایبـەتی لەبەرچـاو گیرابـێ بـۆ تایبەتمەندییەی دیاری کراو یا نادیار، ناوەکە پێی دەوترێ* ***نادیـار****. ل٧٧* ). ئـەگینا ئەگەر وانەبێ ناوەکە **دیارە**. یاسای ڤیژلاس ئێستا لەسـەر بنـەمای (دیـار بـوون) لێکدەدرێتەوە، (*لە کاریگەری ئەمرۆکەی زمانی ئێمەدا، ئەگەر پیتێکـی پێناسـە، ناوی گشتی دیاری نەکردبێ، وەیا پیتی پێناسە لە ئارادابێت، وەلێ ناوەکە دیـاری نەکا، ناتوانین qui لـە دوا دابنـێین. ل٧٧* ). دوای ئـەم بابەتـە، شـیکردنەوەیەکی

---

[1] - ئەم باسە قەرزدانی **ئارنوایە** و، ساڵێك پێش بڵاوبوونەوەی دەستوور لە نامەکانی ئەودا بەرچـاو دەکـەوت. بڕوانە **سان بۆڤ** هـ. س. ل٥٣٦ بە دواوە. بە داخەوە دەستوور بەهۆی گەلاڵـەی شـاراوەی خـۆی، لەبەرئـەوەی ڤیجلاس لە نموونەکانی نارازیانی خۆی ئاگادار نەبووە، لەبارەی دا بە ویژدان یا دادپەروەر نەبووە. لە راسـتیدا ڤیجلاس خۆی یەکێکە لەوانەی باسی نموونەیەکی نارازییانی خۆی دەکات (و ئەو حاڵەتە بانگەوازییە، کە ئـەو بۆتە خاوەنی پیتی پێوەلکاندن، وەلێ بە شایانی تێگەیشتنی دادەنێ). سەرەڕای ئەمـە ڤـیجلاس بـە راسـتی روونکردنەوەی ئەزموونی بۆ ئەو رایانە ئەنجام دەدا کە تۆماریان دەکات.

[2] - common noun

[3] - non-definite نادیار وە definite دیار گروپێکی ناوی راڤە دەکـات کـە دەلالـەتی یـەك شـتە کـە ئاخێوەر و گوێگر هەرووکیان دەیزانن (درآمدی بر زبان شناسی / ڤیکتۆریا فـرامکلین، رابـرت رادمـن، نینـا هیامز. ل٦٨٩)

تۆکمەیان هێنا، کە نیشانی دەدا نموونەکانی ناکۆکی ئـەم پرسـە لـە راسـتیدا ئـەو ناوانەن، کە بە چەند تایبەتمەندی بێ پیتـی پێناسـە بوونەتـە **دیـار**. بەشـێك لـەم شیکردنەوەیە لەسەر گریمانەی **ژێرساز** دامەزراوە، کـە خـۆی لـە خۆیـدا شـتێکی سەرنج راکێشە. **دۆمارسییە** و **بۆزە** و ئەوانی تریش تارادەیك لە بارەی ئەم یاسـایە دواون. لێرەدا پێویست ناکا بچینە ناو وردەکارییەکان. خاڵی گـرینگ لـەم دەقـەدا ئەمەیە، کە بزانین، ئەگەر زماننناسی بیەوێ لە سنووری کۆکردنـەوەی راسـتییەکان بەولاوەتر بڕوات و، وەك یەك **زانست** ی راسـتەقینەی لێبێـت (*یـا بـە وتـەی ئـەو ڕۆژگارە ببێتە دەستووری فەلسەفی*)، دەبێ سەرەڕای شـرۆڤە کـردن دەسـت بداتـە روونکردنەوەی لۆجیکی، کە ئەو نموونەی سەرەوە نموونەی میتۆدیکی لو جۆرەیە.

ئەو روونکادنەوانەی پەیوەنـدییان بـە یاسـای **ڤـیجلاس** ەوە هەیـە و زۆر روونکردنـەوەی تریش، کـە لـە **دەسـتووری جیهـانی**[1] دا هـاتوون، تـا رادەیـەك نـاوڕۆك و پیکهاتـەی زماننساییان هەیە، وەلێ لە زۆر حاڵەتدا پوچەڵن و بە شێوەی میکانیکی و نادیـار، پـەنا بۆ ئەو گریمانانە دەبەن کە لە بارەی واقعییەت زەین دان. لە راسـتیدا، بـە بۆچـوونی مـن ئەو رەخنەی ئەمڕۆ لە **دەستووری فەلسەفی** دەگیرێ بێ پاساوە. ئەمڕۆ هەڵـەی گـەورەی ئەم روانگەیە گوایە ئەمەیە: کە لە رادەبەدەر ئەقلگەرایانـە و بنـەما گریمانەییـە و گـوێ ناداتە دیفاکتۆی زمانیی. بەڵام رەخنەی سـەلمێنەرتر ئەمەیـە کـە دەسـتووری فەلسـەفی زیاد لە پێویست باسیکی رووتی واقعەکانی کردووە، بە شێوەیەك کـە چـیتر نـاکرێ وەك پێویسـت **لـۆجیکی** بـێ. واتـە وادەنـوێنێ کـە ناتەواوییـەکان یـا ئاسـتەنگەکانی ئـەم بەرهەمانە، بە تەواوی پێچەوانەی ئەو بابەتەن، کە رەخنەگرانی ئەمڕۆ لایان لێکردۆتـەوە و هەوڵیان داوە، بۆ هـەر نموونەیـەك نیشـانی بـدەن ئـەو ژێرسـازەی ژێرخـانی رواڵـەتی

---

[1] -universal grammar

دەرەوەیەتی چییە؟ و پەیوەندییەکانی نێوان توخمەکان، کە مانا دیاری دەکەن، کامانەن؟ ئەوان کارەکەیان تائیرە شرۆڤەگەراییە. (*هەربەو شێوەیە زمانناسی نوێش، بۆ گەڕان بە دوای ئامانجگەلی سنووردارتری خۆی، بۆ نیشاندانی ئەو یەکانەی پێکهێنەری رووسازی گوتاری دیاری کراون و، بۆ رێکخستنیان لە ناو گروپ و ئەو پەیوەندییانەی لە رووی رواڵەتییەوە دیاریکراون،کەڵك لەو میتۆدانە وەردەگرێ کە تەواو* ***لێکدانەوەیین.*** *هەر کەسێك بێ، لە کاتی خوێندنەوەی ئەم بەرهەمانەدا، زۆرجار لە گوناجاوبوونی شیکردنەوەکان سەرسام دەبێ*). تەنانەت هەر کاتێك شیکردنەوەکان لە رووی واقعییەوە راست بێنە بەرچاو، ئەم حاڵەتە دێتە ئاراوە. بۆ نموونە ژێرسازێك پێشنیار دەکرێ، کە بە راستی ناوەرۆکی مانایی رستەکە دەخاتە روو، بەڵام بنەمای هەڵبژردنی ئەو ژێرسازە (راستبوونی واقعی) لێ دەرچێ، بە نادیاری دەمێنێتەوە. لەم شیکردنەوانەدا ئەوەی ئامادەی نییە، تیورییەکە لە بارەی پێکهاتەی زمان، کە بە وردبینی تەواو داڕێژرابێ و ئەوەندە دەوڵەمەند بێ بتوانێ وەڵامی بابەتی پرسیارەکان بداتەوە. هەرچەندە ئەو نموونانەی پەیوەندییان بە ژێرسازەوە هەیە زۆرن و زۆربەیان ئەرێنی دێنەبەرچاو وەلێ **سەلمێنەر** نین. بە واتایەکی تر، ئەوانە هەروەك شرۆڤە کردنی زمانناسی نوێن، سەرەڕای ئەوەی زۆربەیان لە بەش بەشکردنی ئەو گوتەزایانەی بە بڕگە و بڕگەی تاك مۆرفیم و زاراوە و گروپ، راست دێنە بەرچاو، وەلێ قەناعەتمان پێناکەن. لە هیچ کام لەم دوو حاڵەتەی سەرەوەدا، هیچ تیورییەکی زمانی لە مەڕ بابەتی چییەتی زمان دا نییە، کە ئەوەندە خۆڕاگربێ بتوانێ بە روونی نیشانی بدا، کە بۆچی منداڵ لە فێربوونی زمان ئەم لێکدانەوانە _ نەك لێکدانەوەی باشتر- هەڵدەبژێرێ، یا چۆن زمانناس لە سەر بنەمای زانیارییەکانی خۆی پەی بەم شرۆڤانە دەبات[1].

---

[1]- بۆ لێکۆڵینەوەی پتر لەمەڕ روون کردنەوەی زمانناسی، بڕوانە:

وێڕای ئەوە، لە دەستووری فەلسەفی دا، باسی ئاڵۆزی ئەو میکانیزمە نەکراوە، کە **ژێرساز** بە **رووسازەوە** دەبەستێتەوە، جگە لەم باسە گشتییەی سەرەوە، هیچ تاوتوێکردنێکی ورد لە بارەی چۆنییەتی ئەو یاسایانەی لە دەستووردا هەن، یا لەبارەی بارودۆخی رواڵەتییاندا ئەنجام نەدراوە. سەرەڕای ئەوە، پێکهاتەی ئەبستراکت و ژێرسازی رستەش، لە خودی رستە جیا نەکراوەتەوە.. بە گشتی گریمانە کراوە کە ژێرساز هەمان رستەیە وەلێ بە شێوەیەکی سادەتر و بە ریکخستنێکی سروشتی تر و رێساکانی گواستنەوە و گەردانکردن و لابردن و هیتر، کە پانتاییەکی فراوانی رستەی واقعی دروست دەکات و لەراستیدا هەر لەسەر ئەو رستە سادانەش کاردەکەن. ئەم روانگەیە، بۆ نموونە، لە تیوری رستەسازی و پێکهاتەی **دۆمارسییەدا** زۆر روونە و بێ گومان لەو سەردەمەدا روانگەیەکی زاڵ بووە[١]. دەتوانین شوین پێی ئەم گریمانە بێ

---

Chomsky,Syntactic Stractures "Explaatory Models in Linguistcs" in E Nagel, P. Suppes, A. Tarski (ed) Logic. Methodology and Philosophy of science, Stanford Uuniversity Press (1962): Current Issues in Linguistic Throry, Katz "Mentalism in Lingustic" Language, vol. 40 pp 124-137 (1964).

یەکێك لە تایبەتمەندییە هەر بەرچاوەکانی شرۆڤەگەرایی ئەمەریکایی لە دەهەی ١٩٤٠، جەخت کردنەوە بوو لە سەر پرسەکان لەسەر بنەمای میتۆدەکانی تەواو **دیار** و دیاریکراوی شیکردنەوە. جەخت کردنەوە لەسەر وردبینی و جەخت کردنەوە لەسەر پێویستێتی پاساودانی روون کردنەوە توصیفییەکان، لە تاوتوێ کردنی هەندێك پەیوەندی سەربەخۆی زماندا، بە یارمەتییەکی گرینگ دادەنرێ. وەلێ ئەو پابەندییەی ئەم زمانناسانە بۆ سەلماندن دایدەنێن (بە تایبەتی سەلماندن دەبێ، بە واتای میتۆناسانەی١٩٤٠ شێوازدار بێ) ئەوەندە دەست و پێگربوون کە هەرکارێکیان دەکردە مەحاڵ. سەرەڕای ئەمە هێندێك کاردانەوە بەرامبەر ئەم ئاستەنگ دروستکردنە (وە بە تایبەتی هەر میتۆدێکی دیاری شیکردنەوە، بە ئەندازەی هەر میتۆدێکی تر بایەخی هەیە) لە گرینگی شاراوەی ئەو پرسەی کەم دەکردەوە.

[١]- لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ بزانین ئەگەر باسەکانی **دەستووری پۆرت رۆیاڵ**، بە شێوەی وەرگێڕانی وشەیی لێکبدرێنەوە، رستە ژێرسازەکان لە رستە واقعییەکان جیاناکرێنەوە. واتای ئەم باسە نزیکانە لە **دەستووری**

بنەمایە، کە **ژێرساز** جگە لە ڕێکخستنی سادەی ڕستەکان شتێکی تر نییە، لە گریمانە دیکارتییەکاندا هەڵبگرین، ئەو گریمانانەی ئەو لەسەر ئەو بنەمایەی چییەتی بیرکردنەوە بە گشتی و تێگەیشتن دیاری دەکەن، پێویستە بە دەروونگەرایی و وردبینی لە ئاگایی کەسەکەدا بدۆزرێتەوە.

سەرەڕای ئەم کەم و کورییانە، دۆزینەوەکانی زمانناسی لەمەڕ ڕێکخراوی دەستوور زۆر بەرچاون و، تاوتوێکردنی وردی ئەم بەرهەمانە بۆ زمانناس، کە بێ پێشوەخت حوکمدان، لەبارەی ئاستەنگی ئەو لێکدانەوە زمانییانەی ڕووبەڕووی دەبنەوە، زۆر بە کەڵکن. سەرەڕای ئەم دەسکەوتانەش، پەیڕەوانی **دەستووری هاوبەشی گشتی** سەدەکانی حەڤدەهەم و هەژدەهەم، دەسکەوتی تری بەنرخیان هەبووە: ئەوان پرسی گۆڕانی ڕەوتی زمانناسی لە **مێژووی سروشتی**یەوە بۆ **فەلسەفەی سروشتی**یان بەروونی نیشان داوە و، **جەخت** لەسەر گرینگی بە دواداچوونی بنەما گشتییەکان و ڕوونکردنەوەی لۆجیکیانەی واقعیەتە زمانییەکمان دەکەنەوە.

---

**گەردانکردنی بەرهەمهێن**، لەو جۆرەیە کە لە سەرچاوەکانی یاداشتی ژمارە **٩٣** دا هاتووە. ئەم دەستوورەی دوایی لەسەر بنەمای ئەم گریمانەیە، کە ئەو پێکهاتانەی **ڕێسای گەردانکردن** کاریان پێدەکات، شکلی ئەبستراکاتی **ژێرسازین،** نەك **ڕستەی واقعی.** لە پاڵ ئەمەشدا پێویستە بزانین کە **تیوری گەردانکردنەکان** کە سەرەتا بە هۆی **هاریس** و بەدەر لە چوارچێوەی **دەستووری بەرهەمهێن** خرایە ڕوو، گەردانکردنەکان بە پەیوەندی واقعی دەزانن و لە ڕاستیدا لەم بارەوە لە بیرو بڕوای **دۆمارسییە** و ئەوانی تر زۆر نزیکە. بڕوانە:

Z. S. Harris, "Co-occurance and Transformation in Linguistic Strature" Language vol. 33, pp283-340, 19570 

بۆ بە دواداچوونی پترلەم بارەوە بڕوانە: Chomsky, Current Issues in Linguistic Theory, p62.

# فێربوون و کارایی زمان

ئێمە تائیستا تایبەتمەندی دیار و بنەما گرینگەکانی زمانناسی دیکارتیمان لەمەر چییەتی زمان روونکردۆتەوە و، گۆڕنکارییەکانمان لە سەردەمی دیکارتەوە تا هامبۆڵت تاوتوێ کردووە. لەم قۆناغەدا بەهۆی زەمینەی عەقڵگرایانەی تیوری زەین، چەند بۆچوون لەبارەی چۆنییەتی فێربوون و کاریگەریی زمان، سەریان هەڵداوە، کە لە راستیدا ئاکامی لاوەکی لێکۆڵینەوە زمانییەکان بووە. ئێستا ئەم بیروهزرانە تا ماوەیەکی زۆر، ئەو بایەخەیان بۆ خۆیان دەستەبەر کردووە کە شایستەیانە، هەرچەندە دووبارە دەرکەوتنەوەیان (*وەك دەرکەوتنەوەی دووبارەی چەمکە بنەماییەکانی دەستووری گەردانکردن*) لە راستیدا بە رووداوێکی سەربەخۆ ئەژمار دەکرێ.

زانیاری سەرەکی زمانناسی دیکارتی ئەمەیە، کە خەسڵەتی گشتی پێکهاتەی دەستووریی کە لە هەموو زمانەکاندا هاوبەشە، لە سەر هەندێك تایبەتمەندی بنەڕەتی زەین دارێژراوە. هەر ئەم گریمانە بوو کە پەیڕەوانی دەستووری فەلسەفی هاندا، لە بری لە دەستوورێکی زمانی تایبەت، بیر لە زەمینەی دەستووری گشتی بکەنەوە و، لە بیروراکانی هامبۆڵت دا بەم شێوەیە خرایە روو، کە شیکردنەوەی قووڵی زمان جۆری (شێوەی زمانی) کە لەناو جۆرەکانی تاك و نەتەوایەتیدا هاوبەشە، ئاشکرا دەکات. بەم پێیە هێندێك جیهانییەکانی زمان بۆ فرەچەشنی زمانی مرۆڤ چەندین ئاستەنگ دەخوڵقێنن[1]. تاوتوێ کردنی دیفاکتۆ هاوبەشەکان،

---

[1]- پێویستە ئاگادار بین کە ئەگەر توخمە هاوبەشەکانی زمانیی بەم شێوەیە پێناسە بکرێن، ئێتر پێویست بە بوونیان ناکات لە هەموو زمانەکاندا. کەواتە کاتێك کە بانگەشەی ئەوە دەکرێ، کۆمەڵێکی دیاریکراو لە

کە شێوەی هەموو زمانــە مرۆییــەکان دیــاری دەکــات پێــی دەوتــرێ **دەســتووری گشتی**یە. ئەم دیفاکتۆیە هاوبەشانە ناکرێ فێریان بین، بەڵکو بنەماکانی ڕێکخەری زەینی نیشان دەدەن، کە ئامادەکاری بــۆ فێربــوونی زمــان دەکــەن و زانیارییــەکان دەگۆڕن بۆ مەعریفە. بە گەڕاندنەوەی ئەم تایبەتمەندییانە بۆ زەین، وەك بەهرەیەکی زگماکی، سەلماندنی ئەم ڕاستییە بەرچاوە فەراهەم دەکات، کە ئاخێوەری زمانەکــە زۆر بابەت کە فێریان نە بووە دەیانزانێ. زماننا‌سی دیکارتی بە تێڕوانینێکی ئاوا، لــە پرســی فێربــوونی زمــان و شــتە جیهانییــەکانی زمانــدا، ڕای دەروونناســانی ئەقڵگەرای سەدەی حەڤدەهەم، لە بارەی زەینی مرۆڤ گشتگیر دەکات. ڕەنگــە یــە کەمین نیشانە لەوانەی کە دواتر بوو بە بابــەتێکی گــرینگ، لــە کتێبــی **هیربــێرت شیربریای** دابێ بە ناوی **لە بــواری حەقیقــەت دا** (١٦٤٢). نــاوبراو لــەو کتێبــەدا دەڵێ: (*بنەماو چەمکەکان لە زەیندا نەخشەیان کێشراوە*) کــە (*ئێمــە ئەوانــە وەك بەهرەیەکی ڕاستەوخۆی سروشتی، وەك غەریزەیەکی سروشتی... دەکەینە بابــەتی. ل١٣٣*). هەرچــەندە ئــەم چــەمکە یــا تێگەیشــتنە هاوبەشــانە (*شــتومەك دەیانبزوێنێ*)، بەڵام (*هیچ کەس، هەرچەندە ساویلکە بێت، ناڵی ئەم چەمکانە لــە خودی شتەکانەوە هاتوون. ل١٢٦*). بە لێکدانەوەیەکی وردتر، ئــەم چــەمکانە بــۆ

---

تایبەتمەندییەکانی فۆنێتیکی و فۆنۆلۆژی هاوبەش پێکدێنێ، بەو مانایە نییە کە هەر کام لەم تایبەتمەندییانە، لە هەموو زمانەکاندا دەوری هەیە، بەڵکو هەر زمانێك لە نــاو توانــای ئــەم سیســتمەی تایبەتمەندییــەکان دا دەسدەکات بە هەڵبژاردن. **بۆزە** لە هەمان سەرچاوە لە ل٩ دا، ئاوا دەنووسێ:

ئەم توخمە سەرەکییانەی زمان... لە ڕاستیدا بوونیان لە هەموو زمانەکاندا پێویستە، تا شرۆڤە و شــیکردنەوە و ئەبستراکتی بیرکردنەوە هەستپێکراو بێ. وەلێ من ناڵێم لە بــارەی پێویســتێتی تایبــەت دەدوێــم، کــە ئــەم ئازادییە بە هیچ زمانێکی تایبەت نابەخشێ، تا ئەم پێویستییانە ڕت کاتەوە. من تەنیا دەمەوێ پێویســتێتی پەیوەست بە یەك جۆر نیشان بدەم، کە ئەندازە و ڕادەی ئەو هەڵبژاردنــەی دەتــوانین ئــەنجامی بــدەین، دیــاری دەکات.

ناسینی شتەکان و پەیبردن بە تایبەتمەندی پەیوەندی نێوانیان، پێویستن. هەرچەندە دیفاکتۆ زەینییەکان، کە دەرئەنجامی ئەم چەمکە هاوبەشانەن (*وێدەچێ لە نەبوون یا غیابی شتەکەدا بزر بن، وەلێ ناتوانن بە تەواوی چالاك بن، چونکە پەیوەندی نێوان ئەوانە و شتەکان دوو لایەنەیە... تەنیا بە یارمەتی ئەوانەیە زەین دەتوانێ لە شانەی ئاشنا و نائاشنا دا بڕیار بدات کە ئایا توانا زەینییەکانی ئێمە مەعریفەی وردیان لەمەڕ واقعییاتەکاندا هەیە یان نا؟ ل١٠٥*). بەکەڵك وەرگرتن لەم واقعییەتە زەینییە کە (*سروشت لە سەر تابلۆی ویژدانی ئێمەی هەڵکەندوە*)، دەتوانین تاك تاکی هەستەکانمان لەگەڵ یەکتر ئاوێتە یا بەراورد بکەین و، تاقیکردنەوەکانیش لەسەر بنەمای شتەکان و تایبەتمەندییەکانیان و ئەو رووداوانەی دەرکەوتەی شتەکانن، لێبکدەینەوە. ئاشکرایە کە ناتوانین ئەم بنەمایانەی لێکدانەوە، لە رێگەی تاقیکردنەوەوە فێربین، چونکە ئەوانە بەتەواوی لە ئەمونی مرۆڤ سەربەخۆن. بە پێی تیوری **هیربێت**:

**(ئەوان) ئەوەندە لە دەرئەنجامی تاقیکردنەوە و بینین دوورن، کە بێ لەبەردەست دابوونی هێندێکیان، یا لانیکەم یەکێکیان، هیچ ئەزموونێکمان نەدەبوو، یا نەماندەتوانی ببینین. چونکە ئەگەر سەرەتا روحی ئێمە ئەوەندە نەبوایە بتوانین سروشتی شتەکان تاوتوێ بکەین (وە ئێمە ئەم دەستوورە لە شتەکان وەرناگرین)، وە ئەگەر ئێمە بۆ ئەم کارە خاوەنی چەمکی هاوبەش نەباین، هەرگیز نەماندەتوانی جیاوازی لە نیوان شتەکان دابنێین یا پەی بە پێکهاتەی گشتی ئەوان ببەین و شکڵی پوچ و وێنەی ترسناك، بێ هیچ مانایەك و هێندێك جار لەگەڵ مەترسی زۆردا، بەبەرچاوماندا تێدەپەڕین. ئەگەر نەخشەی ئەو چەمکانە لە زەینی ئێمە دا نەکێشرابایەوە، تا توانای بەراورد کردنمان پێ ببەخشێ، چۆن دەمانتوانی خێر و شەڕ لێکجیا بکەینەوە؟ لە کۆتایی دا، هەرکەس بیەوێ بزانێ تایبەتمەندییەکانی دەرەوەی شتەکان چییە، تا**

**کویَ کاردەکەنە سەر تێگەیشتنی راست و دروستی ئێمە و، هەروەها دەیانەویَ بزانن ئێمە چ شتێك دێنینە ئاراوە و چ شتێك دەرئەنجامی سەرچاوەی رێکەوت و بێگانەیە، وەیا چ شتێك دەرئەنجامی کاریگەری جینێتیکی یا هۆکارە سروشتییەکانە، ئەوا بە ئاڕاستە ئەم پرنسیپانە دەڕوا. ئێمە نەك هەر گوێ لە دەنگی سروشت دەگرین لە کاتی جیاکردنەوەی خێر و شەڕ و جیاکردنەوەی کەڵك و بێ کەڵك، بەڵکو ئەو کاتەی راست لە درۆ جیا دەکەینەوە، کەڵك لە توانا شاراوەکانمان وەردەگرین، خۆ ئەگەر شتەکان ببنە هۆی وروژاندنی ئەو تواناییانە، ئەوا بە خێرایی کاردانەوەمان لەبەرامبەریاندا دەبێ. (ل١٠٥-١٠٦)**

تەنیا بە کەڵك وەرگرتن لە (توانا غەریزی یا بیرۆکە هاوبەشەکانە)، کە زەین دەتوانێ دەریانبخا (ئایا تواناکانی زەینی ئێمە بە دروستی یا بە هەڵە کەڵکی لە پەی پێبردنی خۆی، وەرگرتووە؟ ل٨٧). کەواتە ئەمە **غەریزەی سروشییە**[1] رێنوێنیمان دەکات بۆ ئەوەی، چۆنییەتی و پانتایی ئەو شتە بزانین کە دەمانەوێ فێری ببین و هیوامان پێی بێت، یا بە دوایدا بگەڕێین. (ل١٣٢).

پێویستە وردبین بین لە دیاری کردنی چەمکە هاوبەش و بنەما تیورییەکانی رێخستنی زەین، کە رێگە دەدەن تاقیکردنەوە سەربگرێ. بە بۆچوونی **هێربێرت** پێوەری سەرەکی غەرەیزەی سروشتی، هەمان **رەزامەندی گشتییە**[2] (ل٣٩). وەلێ پێویستە دوو بنەما لەبەرچاو بگیرێن، **یەکەم:** مەبەست لە رەزامەندی گشتی رەزامەنی **کەسانی هاوسەنگە**[3]، (ل١٠٥). بە واتایەکی تردەبێ ئەوانە بخەینە لاوە کە لەرووی زەینییەوە **نەخۆش** یا **شێتن** (ل١٣٩) هەروەها ئەوانەی **سەرکێش**،

---

[1] -natural instinct

[2] -universal consent

[3] -normal men

**گەمژە، حۆل** یا **بێ ئەقڵن**. (ل١٢٥). هەرچەندە ئەم جۆرە کەسانەش، ڕەنگە بە تەواویی لەم توانایانە بێ بەری نەبن و، ڕەنگە لە سەرخۆش و شێت و منداڵانیشدا، هێزی دەروونی لەرادەبەدەر هەبێ کە نیشانەی سەلامەتیانە . ل١٢٥). وەلێ دەتوانین ڕەزامەندی گشتی لەمەڕ چەمکە هاوبەشەکان، تەنیا لە کەسانی ئاسایی و لۆجیکی و بە ویژدان، چاوەڕوان بکەین. **دووەم: تاقیکردنەوەی** گونجاو بۆ ئەکتیڤ کردن و خواستنی ئەم بنەمایانە پێویستە. (یاسای گشتی چەمکە هاوبەشەکان و لە ڕاستیدا، یاساکانی تری شێوەکانی مەعریفە ئەمەیە، کە تا کاتێك شتەکان نەیانوروژاندون، هەروا بە چالاکی بمێننەوە. (ل ١٢٠). بەم پێیە چەمکە هاوبەشەکان، بابەتی وەك تواناکانی بینین، بیستن، خۆشەویستی، حەزو ئارەزوو و هیترن، کە لەگەڵیاندا لەدایك دەبین و (ئەگەر ئەو شتانەی لەبەرچاومان گرتوون ئامادە نەبن، ئەوا دەرناکەون و تەنانەت غاییبیش دەبن و هیچ نیشانەیەکی بوونیشیان لە دوای خۆیان بەجێناهێڵن. (ل١٣٢). وەلێ نابێ ئەم ڕاستییە بەرچاومان لە بەرامبەر ئەم واقعییەتەدا بگرێ، کە (*پێویستە چەمکە هاوبەشەکان، نەك دەرئەنجامی خودی ئەم تاقیکردنەوانە، بە بنەما دابنێین و، بزانین کە هیچ تاقیکردنەوەیەك بێ ئەوان سەرناگرێ*،) و ئەم تیورییەی کە دەڵێ (*زەینی ئێمە وەك تابلۆیەکی سپی وایە و، گوایە ئێمە توانای مامەڵەکردن لەگەڵ شتەکان، لە خودی شتەکانەوە وەردەگرین*) وتەیەکی بێ مانایە. (ل١٣٢)

چەمکە هاوبەشەکان (**خۆیان پێکەوە پەیوەستن**) و دەتوانین وەك یەك سیستم ڕێکیان بخەین (ل١٢٠) و هەرچەندە تواناگەلی بێ سنوور لە بەرپەرچدانەوەی شتگەلی بێ سنووردا سەرهەڵدەدەن، دەتوانین تێکڕای ئەم چەمکە هاوبەشانەی ئەم سیستمەی واقعیاتەکان لەئامیز دەگرن، لە ڕێگەی چەند گوزارەی دیاریکراو تێیان

بگەین. (ل١٠٦). نابێ ئەم سیستەمەی چەمکەکان لەگەڵ لۆجیك بە یەك شت بزانین، بەڵکو ئەم سیستەمە تەنیا ئەو بەشەی مەعریفەیە، کە ئێمە لە سەرەتای بەرنامەی دروست بوونمانەوە بووینەتە خاوەنی) و پێویستە بزانین کە (***چۆنییەتی غەریزەی*** *سروشتی ئەمەیە کە بە شێوەیەکی لۆجیکی خۆی تێربکا واتە بێ پێشبینی داهاتوو*). لە حاڵەتێکدا (***لۆجیك*** *پرۆسەیەکە تا ئەو جێگایەی بتوانێ، چەمکە هاوبەشەکان بۆ پێشبینی کردنی داهاتوو بەکار دێنێ*) (ل١٢٠-١٢١).

**هێربێرت** لە بە سەرکردنەوەی بنەماکانی لێکدانەوەی جێنێتیکی، کە پێشمەرجی تاقیکردنەوە و مەعریفەن، لەجەخت کردنەوە لەسەر ئەوەی ئەمانە نائاگایانە و شاراوەن و، بۆ چالاك بوونیان یا وریا کردنەوەیان پێویستییان بە بزوێنەری دەرەکی هەیە، پتر ئەو تیورییە دەروونناسییەی خستۆتە روو، کە بنچینەی زماناسی دیکارتییە، هەر بە هەمان شێوە جەختی لەسەر ئەو لایەنانەی مەعریفە کردەوە، کە بە هۆی **دیکارت** و دواتر پەیڕەوانی ئینگلیزی **ئیفلاتون** و **لایب نیتس** و **کانت** هاتنە ئاراوە[١].

---

[١]- هەمووان ئاگاداری ئەم گۆڕانکارییانەن، تەنیا ئیفلاتونگەرایانی ئینگلیسی سەدەی حەڤدەهەم نەبێ. بۆ باسکردنی ئەوانە و بە تایبەتی بایەخدانیان بەم وتەیە: (بڕواگەل و ئەو گوتەزایانەی کە لە هەر هێمایەك بۆ شتەکان بەشدارن و یەکییەتی و یەك رەنگی هەر تاقیکردنەوەیەك فەراهەم دەکەن. بڕوانە :

A. O. Lovejoy"Kant and the English Platonists" in Essays Philosophical and Psychological in Honor of Willian James, NewYork, Longman Green & Co. (1908)

لێکدانەوەی **لاڤجۆی** پتر لەسەر بنەمای ئەو نووسینەی خوارەوەیە:

G. Lyons, L idealism en Angleterre au XVIII siecle, Paris (1888)

هەروەها بڕوانە :

J. Passmore, Ralph Cuworth, Cambridge University Press (1951): L. Gysi, Platonism and Cartesianism in the Philosophy of Ralph Cudworth, Bern, Verlag Herbert Lang and Cie (1962)

ئەو دەروونناسییەی کـە بـەم شـێوەیە دەخرێتـە روو، جـۆرێکی ئیفلاتوونگـەرایی پێشینەیە. **لایب نیتس** لە زۆر شوین دا ئەم خاڵە روون دەکاتەوە. ئەو بـڕوای وایـە (*ئەو شتەی ئێمە پێشتر لە زەینمادا بوونی نەبووبێ، ناکرێ فیری بین*) و ئاماژە بـە **تاقیکردنەوەی** ئیفلاتون دەکا لەمەڕ منداڵە کۆیلەکە، تا بیسـەلمێنی کـە (*روح بـە راستی هەموو ئەوانە دەزانێ (لێرەدا مەبەست واقعییـاتی ئەندازیارییـە) و تـەنیا پێویستە ئاگادر بکرێتەوە راستییەکان دیاری بکات. لـە ئاکامـدا زەیـن لانیکـەم خاوەنی وێنەی زەینییە کە راستییەکان لەسـەر ئـەو بنیـاد دەنـرێن. ئەگـەر ئێمـە راستییەکان بە پەیوەندی نێوان وێنەکانی زەین بزانین، تەنانەت دەتـوانین بڵـێین کـە زەین خاوەنی راستییەکانە*)[1] (ل٢٦)

---

چەند گوتەزایەکی تری **دیکارت، لایب نیتز** و کەسانی تر، لەم نووسینەی خوارەوەدا، کە پەیوەندی ئەم روانگەیان لەگەڵ پرسەکانی ئەمڕۆدا بە کورتی روونکردۆتەوە، هاتووە:

Chomsky Aspects of the Theory of Syntax, Ch. 1&8.

هەروەها بـۆ بەدواچـوون لـە بـواری میتـۆدی ژیرایـەتی لـە پرسـی زمـان فیربـوون و ناتـەواوی رێبازەکـانی ئەزموونگەرایی، بڕوانە:

Chomsky Explamentory Models in Linguistic, and Ktz, Philosophy of Language 

هەر لەم بوارەدا بڕوانە **لێنەبێرگ** (ه.س) و هەروەها:

G. Wiley, The Biological Bases for Language

هەروەها بڕوانەبەشی شەشەمی ئەم کتێبە:

J. Fodor &J. Ktz (eds.), The Stracture of Language: readings in the Philisophy of Language, Englewood Cliffs, N. J. Prentice Hall (1964)

[1] -Lleibniz, Discourse on Metaphysics 

گواستنەوەی چەند گوتەزایەکە لە وەرگێراوە ئینگلیزییەکەی **مونتگێمری** (١٩٠٢). **لایـب نیتـز** پـێ لەسـەر تیوری ئیفلاتون دادەگرێ، کە دەبێ لە (هەڵەی گریمانەی **نەمریگەرایی** (ئەزەلییـەت preexistence) پـاك بکرێتەوە). هەر بەم شێوەیەش **کادۆرس** تیوری **بیرهێنانەوە** (reminiscence) بێ پەسـند کردنـی **تیـوری**

دیاره ئەوەی لە زەیندا تۆمار کراوە، بۆ چالاك بوون پێویستی بە بزوێنەری دەرەکی هەیە و، زۆر لەو بنەما تیورییانەی چۆنییەتی بیرکردنـەوە و تاقیکردنـەوە دیـاری دەکەن، دەتوانن نائاگایانە بەکار بهێنرێن. لایب نیتس ئەم خاڵەی بە تایبـەتی لـە شوێنێکی کتێبەکەیدا **وتارە نوێیەکان،** دەخاتە روو.

لە زماناسی **دیکارتی** دا، بنەماکانی زمان و لوجیکی سروشـتی، کـە بـە شـێوە نائاگایانە دەزانرێن[1] و زۆرکات پێشمەرجی فیربوونی زمانن ، پێشگریمانەی گشـتین

**نەمری** کە ئیفلاتون پێشنیاری کردبوو، پەسند دەکا بۆ لێکدانەوە و روون کردنـەوەی ئـەو واقعییەتانـەی کـە لەبەرچاوی گرتوون:

ئەمە تەنیا چەمکی راستەقینە و جێگای پەسـندی روانگـەکانی پێشـووە. مانـای مەعریفـە بیرهێنانەوەیـە، ئەویش نەك بیرهێنانەوەی شتێك کە روح هەر لە بوونەوە ناسیویەتی، بەڵکو لەبـەر ئـەوەی ئـەم مەعریفەیـە، پەی بردنی زەین بە شتەکان، بە هۆی چالاکی دەروونی و خۆیەتییە، کە چالاکانە لە زەین دەرژێ.

(Treatise Concering Eternal and Immutable Morlity ل٤٢٤، ژمارەی لاپەلاەکان لێـرەو لە خوارەوە دەگەڕێتەوە بۆ یەکەمین چاپی کتێبی **کادۆرس** لە ئەمەریکا بەرگی ٢، ساڵی ١٨٣٨.)

بۆچوونی لایب نیتز لە ( Discourse on Metaphysics, Chap. 26) لەسەر ئـەو بنەمایـەی کـە (زەین لە هەموو کاتێکی بیرکردنەوەدا داهاتوو لێکدەداتەوە و و لە هەنووکەدا، لەمەڕ ئەوەی لـە داهـاتوودا بە شێوەیەکی رێك پێك بیری لێدەکاتەوە، بیرکردنەوەیەکی نارێك و تێکەڵپێکەڵی هەیـە) رەنگـە بتـوانێ بـەم مانایەدا بزانێ، کە ناوبراو بڕوای بە دووربینی (insight) بنەمایی زمان (و بیرکردنەوە) هەیە کە لـە بەشـی ٢ ئاماژەمان پێکردووە.

[1]- بڕوانە بۆزە هـ. س. ل١٥و ١٦. ئەو ئەبستراکتی دەستووری جگە لە (چییەتی زمان کە دەرکەوتوو بە هۆی کردەکانی بە ئەنجام گەیشتووە و لەکۆمەڵێك چەمك دا کورت کراوەتەوە) بەشتێکی تر نازانێ:

ئەم شتە تاك و جوانانەی ئەم ئەبستراکتە لە زماندا دەری دەخا... لە ئەقڵمندی هەمیشەییەوە هـاتووە کـە بەرەو بێ ئاگایی خۆی دەمانبا... رەنگە بێهوودە بێ ئەگەر بڵێین ئەو کەسانەی بە باشترین شێوە دەدوێن، پەی بەم بنەما وردە نابەن. ئەم جۆرە کەسانە چۆن دەتوانن ئەم بنەمایانە تا ئەو ئاستە بەرزو کامڵ بەکاریان بێنن، بێ ئەوەی لە هیچ رێگەیەکەوە لە بوونیان ئاگادار بن؟ من ئەوە پشت راست دەکەمەوە، کە رەنگە ئـەوان لـە بارودۆخێـك دا نـەبووبن بتـوانن بـێ دواکـەوتن لێکدانـەوە بـۆ ئـەم بنەمایانـە بکـەن، چـونکە کۆمەڵـە و سیستمەکەیان تاوتوێ نەکردووە. بەڵام ئەمان پەیڕەوەی ئەو بنەمایانە دەکـەن، چـونکە هەسـت دەکـەن ئـەم

نەك دەرئەنجامی ئۆرگانیزە بوون یا فێرکردن[1]. بۆ نموونە کاتێك **کۆردۆموا** فێربوونی زمـــان (هـ س لـــە ٤٠ بـــەدواوە) لەبەرچـــاو دەگـــرێ، باســـی رۆڵـــی فێرکـــردن و مەرجداربوونی دەکا، وەلێ هاوکات ئاگادارە کە زۆربەی منداڵان دەیـزانن، بـەجیا لە هەر جۆرە فێرکردنێکی راستەوخۆ و بابەتی فیری بوون[2] و بەو دەرئەنجام دەگـات

---

بنەمایانە لە دەروونیاندا بوونی هەیە. ئەوان ناتوانن خۆیان لە کاریگەری ئەم لۆجیکە بدزنەوە، ئەو لۆجیکەی بە یەکجارەکی و بێ بەرگری، رێنوێنی جیهانی پاك و خاوین بکـەن لـە کردەوەکانیانـدا. کەواتـە دەسـتووری زمانی گشتی شتێك نییە جگە لە شرۆڤەی ئەقلانی شێوەکانی ئەم لۆجیکە سروشتی و زەینییە (زاتییە).

[1]- بڕوانە ل٥٨، روانگە دیکارتییە باوەکان بە رواڵەت ئەمانەن کـە هەرچـەندە ئـەم بنەمایانـە نائاگایانـە دەخرێنە گەڕ، دەتوانین بە دەروونگەرایی لێیان ئاگادار بین.

[2]- (بەڵام زۆرجار بە ماندووبوونێکی کەم بۆ فێرکردنی منداڵان تێدەگەین، کە ئـەوان نـاوی هـەزار شـتی تـر دەزانن تەنانەت ئێمە مەبەستمان نەبووە ئاماژەشی پێ بکەین. لـەوە سەرسـوڕهێنەرتر ئەمەیـە، کاتێـك کـە دەبینین منداڵی دوو یا سێ ساڵە، تـەنیا بـە هیمـەتی تێگەیشـتنی خۆیـان، دەتـوانن لـە نـاو تێکـڕای ئـەو پێکهاتانەی ئێمە کاتی ئاخاوتن لە بارەی شتێکدا دەریان دەبڕین، ئەو ناوە دیاری بکەن کـە ئێمـە دەمانـەوێ بۆی دابنێین. ١٤٧و ٤٨).

هەروەها ناوبراو دەڵێ: منداڵان زمانی دایکی خۆیان باشتر فێر دەبن لەو گەورانەی دەیانـەوێ زمـانێکی نـوێ فێربن. بەراوردکردنی ئەم بۆچوونە دواکەوتوو وەلێ راستانە، کە زۆربەی نووسەرانی ئەمڕۆ بۆ زمان فێـر بـوون وێنای دەکەن، سەرنجراکێشە. لە راستیدا زۆربەی ئەنجامگیری ئەم نووسەرانە نەك لەسەر بنەمای بینین، بـەڵکو لەسەر بنەمای گریمانەی پێشوەخت لە بارەی بابەتێك دایە کە بڕوایان وایە روودەدات. بۆ نموونـە بگـەڕێوە بـۆ ئەم تیۆرییە کە چۆن **خووە زمانییەکان** بە هۆی فێربوون، پەروەردەکردن، مەرجداری، بـە هێـز دەبـن و دێنـە ئاراوە. بڕوانە: **بلۆم فیلد**، هـ. س ل٢٩ تا ٣١، هەروەها:

Wittgenstein, Blue Book, (Blackwell, 1958) pp. 1, 12-13, 77: Skinner, Verbal Behavior (New York, Appelton- Century- Corfts, 1957): Quine, Word and Object 9M. I. T. Wiley, 1960) 

هێندێك جار لە باس و خواسی نوێدا، پەنا دەبرێتە بەر پرۆسەی **گشتگیرکردن** یا **ئەبستراکت کردن** کە وێرای پـەی بـردن بە مانا و مەرجداریی کاردەکەن، وەلێ پێویستە جەخت لەسەر ئەوە بکەینەوە، کە هیچ پرۆسەیەکی ناسراوی ئـاوا بـوونی نییە، کە بتوانێ زاڵ بێ بەسەر کەم توانایی لێکدانەوەکانی ئەزمونگەرایان لەمەڕ فێربوونی زمان. (بۆ بەدواداچـوونی پـتر بڕوانە سەرچاوەکانی یاداشتی ژمارە ١١٠). پێویستە لە تاوتوێ کردنـی ئـەم پرسـەدا، سـەرنج بدەینـە ئـەو رەخنەیـەی

که پێشگریمانەی زمان فێربوون، بوونی (*ئەقڵمەندی تەواوە، مانای میتۆدی فێربوون و ئاخاوتن، کاریگەری ئەقڵمەندییەکی ئاوایە، ئەقڵمەنییەکی ئەوەنـدە کامـڵ کـە ناتوانین شتێکی لە ئاسایی بەدەری وەك ئەو بدۆزینەوە*). (ل٥٩)

دەسکەوتی ئەقڵگەرایانە دووبارە لە زۆربەی بەرهەمی رۆمانتیستەکاندا دەردەکەوێ. **ا. و. شلگل** دەنووسێ (*دەتوانین ئەقڵمەندی مرۆڤ لەگەڵ مادەیەکی سووتەمەنی بەراورد بکەین، لەگەڵ ئەوشدا کە خۆی ناسوتێنێ، وەك کڵپەیەك لە رووح دێتە دەرێ. ریشەناسی گشتی ل١٣٧*). پەیوەندی لەگەڵ زەینی هەوێنگرتوو، بۆ بێداری ئەقڵ پێویستە. بەڵام بزوێنـەری دەرەکی، تەنیا بۆ دەسبەکاربوونی میکانیزمی جێنێتیکی پێویستە و شـکڵی ئـەو شـتە دیاری دەکا کە فێری بووین. لە راسـتیدا، روونـە کـە (*فێربـوون بـە هـۆی گواسـتنەوەی بابەتەکان، خۆی توانایەکی پێشوەختی فێربوونی زمانە*) (زانستی هونەر ل٢٣٤). بە تەنیا واتایەك زمان لە مرۆڤ دا جێنێتیکییە، مانای (*بە مانایەکی رەسەنتری فەلسەفی، هەرچی دێتە بەرچاو کە بە شێوەیکی سروشتی هی مرۆڤە، دەبێ لە رێگەی چالاکی خۆیەوە بێتـە سەر شانۆی دەرکەوتن*) (هـ س ل٢٣٥). لەگەڵ ئەوشدا دەتوانین لە سـەر مەبەسـتی وردی

---

**کادۆرس** (هـ. س. ل٦٤٢) بۆ رەتکردنەوەی ئەو هەوڵە نووسیویەتی، کە ئامـانجی سـەلماندنی ئـەم خاڵەیـە: رەنگـە وێنـا گشتییەکان، لە ئاکامی **دابڕین** لە وێنە هەستییەکان (خەیاڵ و وەهم) بەرهەم بێن و، لە کۆتـایی دا پێویسـت بـەوە ناکـا پێکهاتەی جێنێتیکی زەین بە (**بدیهی**) ئەژمار بکەین. ناوبراو دەڵێ، زەینی تاك یـا دەزانـێ چ لـەو وەهـم و خەیاڵانـە بکا، چۆن لێکدانەوەیان بکاو چ شکلێکیان بە باڵا ببڕێ) کە لە حاڵـەتێکی ئـاوادا ئـەم پرسـە سـەرهەڵ دەدا، کـە بـونی وێناکردنێکی پێشوەخت پێویستە، یا نازانێ و لەم حاڵەتەدا ناشیانە هەڵس و کەوت دەکات، چونکە کاری **دابـڕین** رەنگـە بە دەرئەنجامی بێ ماناو دڵخواز کۆتایی بێت.

بەکورتی، پەنابردنە بەر **گشتگیرکردن**، نابێتە هۆی ئەوەی لێکدانەوەی وردی بنەماکان، کە لەسـەر بنچـینەی ئەوان وەرگرتنی بیرو ڕاو مەعریفە دەستەبەر دەکرێ، ئیتر پێویست نییە. دەتوانین بڵێین **گشتگیرکردن** یا دابڕین لەم چەمکە نوێیەدا، پەیوەندییەکی دیاری کراوی بەو شتەوە نییە، کە ئێمە لە چەمکی هونـەری خۆمـان لـە فەلسەفە و دەروونناسی و زمانناسی، چاوەڕوانی دەکەین.

**شلگل** لەم باسانە بدوێین، گومانی تێدا نییە کە **هامبۆڵت** لە رایەکانی خۆی دا لە بـواری فێربـوون زمانـدا، لـە ژێـر کاریگـەری ئیفلاتـون دا بـووە. (فێربـوون تـەنیا... دووبـارە بەرهەمهێنانەوەیە) (هـ س ل١٢٦). زمان بـە پێچـەوانەی روالـەتی دەرەوەی (*فێربـوونی مەحاڵە... بەڵکو تەنیا لە دەروونـدا بێدار دەکرێتەوە و دەردەکەوێ. تەنیا دەتوانین سـەری رایەڵکەکەی بە دەستەوە بگرین، ئەو رایەڵکەە بە پێی پێویستی خـۆی گەشـە دەکـات*)، کەواتە زمان لە راستیدا (خۆخولقێنی تاکەکانە). (ل٥٠):

**فێربوونی وشەکان لەلایەن مندالانەوە نە تۆمارکردنە لە یادگە دا و نە دەنگـدار کردنییانـە لەسەر لێوەکان، گەشەسەندنی توانای زمانی منداڵان هۆکریاوی زیادبونی تەمەن و راهێنان و تاقیکردنەوەی پترە. (ل٢١)**

**لە هەمان کاتدا فێربوونی زمان لەلایەن منداڵانەوە فێربوونێکی میکـانیکی نییـە، بـەڵکو پشتبەستە بە گەشەکردنی هێزی زمانیی، خۆی نیشاندەری ئەمەیە کـە هێـزە رەسـەنەکانی مرۆیی لە کاتماوەیەکی دیاری کراودا، لە تەمـەنی منـداڵی دا دەردەکـەون و پەیوەسـتن بـە گەشەکردنی منداڵان. تێکڕای ئەو منداڵانەی لە بارو دۆخی جیاوازدا دەژین کەم تا زۆر لـە یەك تەمەندا، کە جیاوازی دیاری کراویان لە منداڵانی جۆراوجۆردا زۆر کەمە، دەسـت بـە قسەکردن و تێگەیشتنی گوتەزا دەکەن. (ل٧٢).**

بەکورتی فێربـوونی زمـان پەیوەنـدی هەیـە بـە گەشـەکردن و دروسـتبوونی ئـەو توانایانەی تارادەیەك لە بارودۆخی دەرەکی دا نەگۆڕن. چەند هۆکاری دەروونی هەن شێوەی ئەو زمانە دیاری دەکەن کە فێـری دەبـن و بەڵگـەی ئەمـەش لێکچـوونی تێکڕای زمانە مرۆییەکان. لەبەر ئەوەی (*مرۆڤ لە هەر حاڵەت و شوێنێکدا لەگـەڵ مرۆڤەکانی تر یەکسانە*) کەواتە منـداڵی مـرۆڤ دەتـوانی فێـری هـەموو زمانێـك

ببێت[١] (ل ٧٢و ٧٣).جگە لەوە ، توانای زمان فێربون لە قۆناغێکی تایبەتیدا کە **قۆناغی ئاڵۆز**[٢]ی زەینە بە پلەی کامڵ بوونی خۆی دەگات.

---

١- بڕوانە Steinthal, Gedachtnissrede, p17

ئەو پێی وایە تێگەیشتنی پرنسیپی هامبۆڵت، بینینی ئەم پرسە بوو، کە (چۆن هیچ شتێك ناتوانێ لە دەرەوە بێتە ناو مرۆڤ، مەگەر ئەوە خۆی بوونی هەبووبێ و چۆن تێکڕای کاریگەرییە دەرەکییەکان تەنیا بزوێنەرێکن بە دەرکەوتنی دەروون. سەرچاوەی هەموو هۆنراوە نووسینەوەی رەسەن و فەلسەفەی رەسەن، سەرچاوەی تێگڕای کاریگەرییە دەرەکییەکان و تێکڕای خولڤاندنە مەزنەکانی مرۆیی، لە قولایی ئەم دەروونەدا شاراوەتەوە و هەر لەو سەرچاوەوە زمان دێتە ئاراوە.

هەروەها **هامبۆڵت** لە بارەی فێرکردندا، نیشاندەری هەمان بیروبۆچونە لەمەڕ رۆلی داهێنەرانەی تاك. ناوبراو لە وتارێکی یەکەمی خۆیدا دژی ستەمی دەوڵەتیی (بڕوانە هـ. س. ل٢٤ بەدواوە) دەڵێ: (بێ گومان فێرکردنی گونجاو، بریتییە لە دانانی ئارەزووی شەخسی بەرامبەر تاك و، خستنە رووی رێگەچارەی جۆراوجۆر و دواتر ئامادەکردنی ئەو بۆ هەڵبژاردنیان، یا لەو باشتر ئامادەکردنی ئەو بۆ داهێنانی رێگەچارە.) هامبۆڵت بڕوای وایە ئەم میتۆدە دەستی دەوڵەتی پێراناگا، چونکە دەوڵەت لە ئامرازێکی دەسەڵاتدارییی و سەرکوت کردن بەولاوە شتێکی تر نییە. بڕوانە کوان هـ. س. ل٤٣). ئەو لە شوێنێکی تردا دەڵێ (شوێنی سەرەکی تێکڕای پێشکەوتنەکانی فێرکردن لە پێکهاتەی دەروونی مرۆڤدا حەشار دراوەو، ئەم پێکهاتەیە تەنیا دەکرێ بوروژێنرێ، نەك بەهۆی چەند ئۆرگانی دەرەکی بخولڤێنرێ. کوان ل١٢٦). (تێگەیشتنی هەرکەسێك وەك هەموو تواناکانی ئەو، بە هۆی چالاکی و داهێنانی خۆی و کەڵك وەرگرتن لە داهێنانی ئەوانی تر، گەشە دەکات. کوان ل٤٢و ٤٣). هەروەها بڕوانە کوان ل١٣٢ بەدواوە. بەراوردکردنی ئەم وتانە لەگەڵ بۆچوونەکانی **هاریس** لە کتێبی **هۆرمز** دا جێگای سەرنجدانە. **هاریس** لێرەدا دەڵێ:

هیچ شتێك لە واتای فێرکردنی گشتی بێ ماناتر نییە. وەك ئەوەی چۆن ئاو لە کوپێك دەکرێ، ئاوا زانستە لە زەینی مرۆڤ بکرێ، گوایە زەین بە تامەزرۆییەوە چاوەڕوانی شتێکە کە بەپێی خۆی بەرەو رووی دێت. هەرچەندە بەڵگەی دەرەکی تا رادەیەك کاریگەرییان هەیە. بەڵام هێزی ناخۆیی و خودی خود، دەرەختێکە میوەکەی تا پێدەگات پەروەردەی دەکات. کۆمەڵە بەرهەمەکان ل٢٠٩)

لێرەشدا مەبەس هەمان رێبازی **سوکرات**ە کە **کادۆرس** ئاوا پێناسەی دەکات:

نابێ زانست وەك شەراب بکرێتە ناو زەینەوە، بەڵکو پێویستە بانگهێشت بکرێت بە ئارامی کەڵکی لێوەربگیرێ، نابێ زەین وەك جامێك لەسەرچاوەی دەرەکی پڕ بکرێ، بەڵکو دەبێ لە زانست بگا و وریا ببێتەوە. هـ. س. ل٤٢٧).

2 -critical period

شـایانی ئەوەیـە، کـە جـەخت بکەینـەوە لەسـەر تێڕوانینـی ئەقلگەرایانـەی سـەدەی حەڤدەهەم، لە بواری فێربوون - بە تایبەتی فێربوونی زمان- بە شێوەیەکی بەڵگەمەنـد و دوور لە دەمارگیری. لەسەر بنەمای ئەم بیرو بڕوایانە، مەعریفە لەسـەر زانیـای پـەرت و بڵاو و ناتەواو هەوێن دەگرێ و، خودی ئەو زانیارییانە، هەرگیز هاوشـێوەیی ئـەو شـتانە دیـاری ناکـەن کـە فێریـان دەبـین. لـە ئاکامـدا ئـەم وێکچـوونەیان، وەك پێشـمەرجی تاقیکردنەوە بە خەسڵەتەکانی زەینیان داناوە. ئەم میتۆدە لە رووی پرنسـیپەوە میتـۆدی لێکدانەوەی ئەمڕۆی ئەو زانایانەیە، کە هـۆگری پێکهاتـەی ئـامرازێکن و تـەنیا چـەند زانیـاری دەرەکـی و دەروونیـان لەبـەر دەسـت دایـە. بـە پێچـەوانەوە لـە بیروبۆچـوونی ئەزموونگەرایانەیاندا هەیە، بە تایبەتی گێڕانەوە نوێیەکانی ئەزموونگـەرایی، لـە بـارەی چۆنییەتی فێربوونی گریمانەکان پێش- ناو. (*واتە فێربوون دەبێ لەسەر بنەمای نوانـدن یـا بەهێز کرد بێ، یا لەسەر بنـەمای میتۆدەکـانی هـەڵێنجان لـە جـۆری سـەرەتای- وەك میتۆدی پێرستناسـی و زمانناسـی نـوێ و هـیتر*). لـە هـەمان کاتـدا ئـەم تێڕوانینـە، تاوتوێکردنی پێشگریمانەکانی لەسەر بنەمای هاوشـکڵی دیـار لـە زانیـاری دەرەکـی دا، واتە لەسەر بنـەمای ئـەوەی دوای فێربـون دەیـزانین یـا لێـی ئاگـادارین- بـە پێویسـت نەزانیوە. لەبەر ئەوە تۆمەتی پێشوەخت وێنا کردن یا دەمـارگیری، کـە زۆرجـار دەچـێتە ناو دەروونناسی و فەلسەفەی ئەقلگەرایی زەین، دیارە لە جێی خۆیدا نییە.

ئەو گریمانە پتەوانەی فەلسەفە و دەروونناسیی ئەقڵگەرایانـە، لەمـەر پێکهاتـەی جێنێتیکی زەین ئامادەیان کردووە، پێویستیی هەرجۆرە جیاکردنەوەیەکی راست و رەوانی نێوان تیوریی پەی پێبردن و تیوری فێربوونیـان رەتکردۆتـەوە. لـە هـەردوو حاڵەتدا تا ئەندازەیەك پرۆسەی یەکسان کار دەکەن: کۆمەڵێك بنەمای جێنێتیکی، زانیارییەکانی هەستەکان لێکدەدەنەوە. بێ دوودڵی، جیاوازی هەیە لە نێوان چالاك

بوونی سەرەتایی پێکهاتەی جینێتیکی و کەڵك لێوەرگرتنی، کاتێك کە بۆ لێکدانەوەی (**دیاری کردن**) یا تاقیکردنەوە بەکار دەبرێن. بە واتایەکی تر، ئەو بیرورا نادیارانەی کە بەردەوام لە زەین دا شاراوەن، رەنگە دەربکەون. لەم قۆناغەدا دەتوانن پەی پێ بردن بەهێز بکەن و ئاستی بەرز بکەنەوە. وەك:

**رەنگە هونەرمەندێکی شارەزا ، ناسکی و سەرسورهێنەریی فراوانی هونەری ببینیّ، و چێژێکی زۆر لە جوڵە و سێبەری وێنەك وەربگریّ، لە کاتێکدا چاوی کەسێکی ئاسایی ئەو ناسکییە بەدی ناکات، یا موزیك ژەنێك دوای بیستنی ژەنیاریی گرۆوپێك موزیکژەن، کە کۆمەڵێك دەنگی جیاواز بە ئاوێتەیەکی جوان بەرجەستە دەکەن، رەنگە بەم پێکەوە گونجاندنەی دەنگەکان سەرمەست بن، لە کاتێکدا گوێی تاکێکی سادە لە تێگەیشتنی ئەمانە دادەمێنیّ. (کادۆرس هـ س ل٤٤٦).**

ئەمە **شارەزایی دەسکەوتەیە**[١] کە جیاوازییەکی ئاوا دەخوڵقێنیّ. (*هەر هونەرمەندێك لە زینی خۆی دا هەڵێنجانی فراوانی هەیە لە شارەزایی و هونەر*) کە توانای پێدەبەخشیّ تا زانیارییە هەستییەکانی بە شێوەیەك لێکبداتەوە کە تێپەڕیّ لەو (*دەنگ و ئاواز و هاتوهاوارەی*) هەستە ئەکتڤکراوەکان دیخەنە بەردەستی، هەروەك زەینی هوشیار کە لەسەر بنەمای (**پێکگرتن و هاونەوایی دەروونی لە پەیوەندییەکان، رێژەکان، توانایەکان و بەراوردکردنی شتەکان لەگەڵ یەکتر**) پەی بە (*سیستمی مەزنی جیهان*) دەبا. بەم پێیە لە کاتی سەیرکردن و (دادوەری کردن) لەبارەی وێنەی دۆستێك، مرۆڤ کەڵك لە وێنەیەکی زەینی نامۆ و دەرەکی، وەلیّ هەبووی پێشوەخت، وەردەگریّ. (ل٤٥٦ و٤٥٧). بەڵام لە روانگەی ئەم زانستە ئەقڵگەرایە، کاتێك کە جیاوازی نێوان فێربوون و

---

١- acquired skill

پەی پێبردن دەرکەوت، هەروەك پرۆسە مەعریفییەکان بەسەر جیاوازییە رواڵەتییەکاندا زاڵ دەبێ. هەر لەبەر ئەمەیە کە لەم روانگە ئەقڵگەرایەوە، زۆرجار دیار نییە بابەتی لێکۆڵینەوە چالاکی زەینە بۆ پەی پێبردن یا بۆ فێربوون، واتە هەڵبژاردنی شێوەی زەینیە لەسەر بنەمای هەستەکان، یا دیاریکردنی شتێکە کە پێشتر نادیار و زارەکی بووە.

**تیوری مەعریفەی**[1] دیکارت بە روونی لە کتێبی (*یاداشتەکان لە بارەی بەرنامەیەکی تایبەتن (١٦٤٧) وەرگێڕانی **هاڵدین** و **راس** ل٤٤٢ و ٤٣٣*) هاتووە:

**... هەر مرۆڤێك سەرەڕای سنووورداری هەستەکان و چۆنییەتیان، هەرچی بەدەم رێوە دەچێتە ناو بیرکردنەوەی ئێمە، بە روونی ئاگادارە و، دەزانێ هەستەکان هیچ وێنەیەکی شتەکان، بەو شێوەی ئێمە لە هزری خوماندا دەیان بینین، نادە بەئێمە. واتا لە وێناکردنی ئێمەدا شتێك نییە، بە شێوەی جێنێتیکی لە زەین یا توانای بیرکدنەوەدا نەبێ، مەگەر لە بارودۆخی وا دابێ کە بگا بە تاقیکردنەوە. بۆنموونە، ئەم واقعیەتەی کە ئێمە دەمانەوێ لە بارەی ئەم یا ئەو وێنە زەینییەی لە بیر و هزرمان دایە بڕیار بدەین (دادوەری بکەین)، پێویستە وابزانین پەیوەندی بە شتێکی دیاری کراوی دەرەکییەوە هەیە، نەك ئەوەی ئەو شتە دەرەکییانە، خۆیان وێناکان لە رێگەی هەستەکانەوە بگوازنەوە بۆ زەینی ئێمە، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەوان شتێك دەگوازنەوە بۆ زەین، کە توانا دەداتە بەر زەین بەهۆی توانای جێنێتیکی خۆی، شکڵ بۆ ئەم وێناکردنانە دیاری بکات. ئاشکرایە ئەندامە هەستەوەرەکان جگە لە جوڵەی شتێکی تر لە شتەکانی دەروە ناهێنن بۆ ناو زەین... لە لایەکی تر، ئێمە هەر ئەو جموجوڵ و شکلانەی لە وانەوە بەدەست دێن، بەو شێوەیە وێنا ناکەین، کە لە ئەندامە هەستەوەرەکاندا دەرکەوتوون... لە ئاکامدا پێویستە بڵێین کە وێناکردنی ئێمە یا بۆچوونمان بۆ جموجوڵەکان، خۆیان لە بونی ئێمەدا هەن. کەواتە لەوێوە کە وێنا کردنەکانی ئێمە لە ئازار و رەنگ و دەنگ و هاوشێوەیان، جێنێتیکین، زەینی ئێمە لە کاتی روودانی هێندێك جموجوڵی جەستەیی دیاریکراودا، ئەم لێکدانەوانە وێنا دەکا، چونکە هیچ هاوشێوەیەکیان لە گەڵ جموجوڵە جەستەییەکاندا نییە. ئایا شتێکی نابەجێتر**

---

[1] - theory of cognition

**لەوە هەیە، کە پێمان وابێ تێکڕای چەمکە هاوبەشەکان کە لە زەینی ئێمە دا رەگ و ریشەیان هەیە، دەرئەنجامی ئەم جموجوڵانەن و بێ ئەوانە ناتوانن درێژە بە بوونی خۆیان بدەن؟ من دەمەوێ دۆستەکەم رێنوێنیم بکات کە کام جوڵەی جەستەیی دەتوانێ ببێتە هۆی سەرهەڵدانی چەمکێکی هاوبەش لە زەینی ئێمەدا؟ وەك چەمکی: ئەو شتانە لەگەڵ یەك شت یەکسانن یا لەگەڵ یەکتری یەکسانن، یا هەرچەمك یا واتایەکی تر کە ئەو بیەوێ. لەبەرئەوە تێکڕای ئەم جموجولانە تایبەتین، وەڵێ چەمکەکان هاوبەشی گشتیین و پەیوەندیان بەو جموجوڵەوە نییە.**

**کادۆرس**یش هەمان بیروڕای دەربڕیوە[1]. ناوبراو ئەو توانا هەڵچووەی هەستەکان، جیا دەکاتەوە لە (توانا مەعریفییەکان، جێنێتیکی و چالاکی مرۆڤ و **تەنیا مرۆڤ** لە رێگەی ئەوانەوە (*دەتوانێ پەی بەو شتانە بەرێ کە لە رێگەی هەستەکانەوە وەریگرتووە یا لە بارەیاندا بڕیار بدات*). ئەم توانا مەعریفییە هەمووی گەنجینەیەکی وێناکردنەکان نییە، بەڵکو (توانای دەرخستنی وێناکردنی شیاوی تێگەیشتن و واتای شتەکانی دەروونی خۆیەتی). (ل٤٢٥). ئەرکی هەست، (*پێدانی شتێکە بە زین، تا بتوانی چالاکی خۆی لەسەر ئەنجام بدات*) کەواتە کاتێك کە سەیری شەقام دەکەین، دەبینین خەڵك خەریکی هاتووچۆن، تەواو بە هەستەکانمان پشتبەست نابین (*کە رادەی زۆری دیاردەکانمان نیشان دەدەن - کڵاو، جل و بەرگ - تەنانەت خودی مرۆڤەکانیش*)، بەڵکو تواناکانی تێگەیشتنی خۆمان لەمەڕ زانیارییە هەستییەکان دەخەینە گەڕ[2]. ل٤٠٩ و ٤١٠). (*ئەو*

---

[1]- لەمەڕ پەیوەندی نێوان کادۆرس و دیکارت، بڕوانە، یاداشتی ژمارە ١١٠ پاسمۆر (هـ. س) و جایسی (هـ. س) بۆ پانتاییەکی فراوانتر بڕوانە:

S. P Lampercht " The Role of Descartes in 17 Century England" Studies in the History of the Ideas, vol. III edited by the Department of Philosophy of Columbia University, Columbia University Press, pp 181-242 (1935)>

**پاسمۆر** بەو ئاکامە دەگات کە (هـ. س) سەرەڕای هێندێك جیاوازی (دیسانەوە نابەجێ نییە کە **کادۆرس** بە **دیکارت** بزانین، چونکە لە بارەی زۆر پرسدا هاوڕان.

[2]- بڕوانە:

Descartes, Meedition II. Hsldane 7 Ross, p155. 

*شێوانە دەرك دەكرێن كە شتەكان بە هۆی ئەوانەوە پەیان پێدەبرێ یا دەناسێنرێن، رۆڵ یا ئەو كاریگەرییانە نین، كە هەڵچووانە لەدەرەوە لەسەر ویژدانی مرۆڤ بنەخشێن، بەڵكوو وێناكردنێكن كە لە لە دروونەوە، چالاكانە گەشە دەكەن و بەكاردەبرێن)*. كەواتە زانستی پێشوەخت لە دیاریكردنی ئەوەی دەیبینین (*وەك بینینی دەموچاوی ئاشنا لە ناو خەڵكدا*) رۆڵێكی گرینگ دەبینێ. (ل٤٢٣-٤٢٤) بەهۆی كەڵك وەرگرتن لە وێنە زەینییەكانی تێگە، كە بەپێی بۆچوونی **ئەرستۆ** (ئەو مەعریفانەی ئەبستراكت تر و لە مادە دوورترن، وردبینتر، بەرچاوتر و تێگەێنترن لەو مەعریفانەی لە مەڕ *شتە بابەتی و نائبستراكتەكاندا هەمانە. ل٤٢٧*) [١]. دەتوانین ئەم گوتەیەش لەبارەی پەی پێبردنمان بۆ شكڵە ئەندازییەكان نیشان بدەین. لە ل ٤٤٥ بە دواوە). ئاشكرایە هەر سێگۆشەیەك، هەستپێكراوێكی نارێكە و ئەگەر سێگۆشەیەك هەبێ كە مادییانەی تەواو بێت، ئێمە ناتوانین بە هۆی هەستەكانمانەوە تێیبگەین (*و هەر سێگۆشەیەك هەر بەو شێوەی كە هەیە، بەئەندازەی رێكترین سێگۆشە كامڵە*). دادوەریمان لە بارەی شتە دەرەكییەكان لەسەر ئەو شكڵە نارێكانەیە و چەمكی (*شكڵی رێك*) لەزەینی ئێمەدا رەگ و ریشەی لە (*رێسا و نموونەو و نموونەییەكان*) دایە كە پێشوەخت لە زەین دا بەرهەمدێ. بە چەمكی یەك (*شكڵی ریك و هاوئاهەنگ و هاوشێوە*) فێری چەمكی سێگۆشە، بەڵكو لە بنەڕەتدا لە خودی سروشتدا هەڵدەچێ: (*چەمكی جوانی ئەندامێكە لە شتە مادییەكاندا*) هەر بە هەمان شێوەیە.

---

ئێمە دەزانین (بەكەڵك وەرگرتن لە زەین) دەتوانین چ ببینین، نەك بە (كەڵكوەرگرتن لە بینایی): كاتێك كە لە پەنجەرەوە دەروانینە دەرەوە و دەڵێین چەند پیاوێك دەبینین بە شەقامەكەدا تێدەپەڕن، بەراستی ئەوانە نابینین بەڵكو وای لێكدەدەینەوە ئەو شتانەی دەیانبینم چەند پیاوێكی ناو شەقامن).

[١]- لەگەڵچ ئەمەشدا (ئەو وێناكردنانەی ئێمە هەمانە بۆ شتە مادییەكان، هەم شتی پەی پێبردنن هەم خەیاڵی) و ئەمەش نیشانی دەدا كە بۆچی ئەندازیاران، پشت بە شكڵ وخشتەكان دەبەستن و (لە گوتار، خوازە و نواندندا، ئاوا دەبێتە هۆی چێژ لێوەرگرتن. ل٤٣٠تا ٤٦٨).

ناتوانین له راستییه پێشوەختەکانی ئەندازیاریش بگەین. تەنیا بــە هــۆی ئــەم **وێناکردنــە دەروونی**یانەوە[1]، بەهۆی (*هێزەکانی مەعریفەی جێنێتیکی*) بەرهەم دێن، زەیــن دەتــوانێ (پەی بە تێکڕای شتومەکی دەرەکی ببا و بیناسێ. ل٤٨٢).

دیکارت هەر ئەم پرسەی بە هەمانشــێوە لــە بــەرگی پێنجــەمی کتێبــی **وەڵامــی ناکۆکەکان** دا باسکردووە:

**کەواتە کاتێك لە قۆناغی منداڵیدا، کلێشــەی سێگۆشــەیەك دەبیــنین کــە لەســەر کاغــەز کێشراوەتەوە، ئەم کلێشەیە هەرچی واتای سێگۆشەیەکی واقعییە، بەو شێوە کە ئەندازیاران تێیگەیشتوون، بە ئێمەی ناڵێ، چونکە سێگۆشەی واقعی لە ناو ئەو کلێشە دایە، هــەروەك پەیکەری میرکۆری لە ناو پارچە تەختەیەکی زبردا. بەڵام لەوشوێنەوە کە ئێمە لە دەروونــی خۆماندا واتای سێگۆشەیەکی واقعیمان هەیە و لە ڕێگەی زەین باشتر تێیدەگەین نــەك لــە ڕێگەی ئەو کلێشە ئاڵۆزەی سێگۆشەیەکی سەر کاغەز، کاتێك شکلێکی ئاڵۆز دەبینین، وەك هەیە تێی ناگەین، بەڵکو وەك سێگۆشەیەکی واقعی پەیی پێدەبەین (هاڵدین و راس. هەمان شوێن بەرگی ٢ ل٢٢٧و ٢٢٨).**

لە ڕوانگەی **کارۆس**ەوە لێکدانەوەی زانیارییە هەستییەکان، بە پــێ شــتەکان و پەیوەنــدی نێوانیان ، **هۆکار** و **هۆکریاو**[2]، پەیوەندی بەش و گشت، هاوڕێکی، ڕێژە، ئەرکی شتەکان و کەڵك لێوەرگرتنی تایبەتیان (لە بارەی **هەمووشتێکی ساختە**[3] یا **شتی سروشتی ئاڵۆز**) و دادوەری ئەخلاقی و شتی تر، هەر هەمووی دەرئــەنجامی چــالاکی ڕێکخســتنی زەیــنن.

---

[1] -inward ideas 

[2] -cause and effect

[3] -things artificial

(له٤٣٣ بەدواوە). هەر ئەم بابەتە لە بارەی هاوئاهەنگی شتومەك لـە بـارەی شـتی وەك (پارچە موزیكێك) یشدا، راستە. هەستەكان وەك (*تیلسكۆب خاوەنی مەودایەكی بینینی دیاریكراون*) كە تەنیا چەند دیمەنی یەك لە دوای یەك و بەشۆكێكمان لەو دیمەنانە دەداتیّ و تەنیا زەینە دەتوانیّ (*وێنەیەكی تۆكمە لـە گشـت*)مـان پێشـكەش بكـات، بـە هـەموو وردەكارییەكان، پەیوەندییەكان، رێژە و كزاڵیتی گشتییانەوە. لەم رووەوە، ئێمە وێناكـانی پەی بردن بە شتەكان نەك وەك (*نەخشێك یا وێنەیەك كە لە دەرەوەرا لەسەر روحمان تۆمار دەكریّ، بەڵكو لە سەر بنەمای خودی وێنایەكی هەسپێكراو كە لە هێزی دەروونی ئەكتیڤ و كۆی زەینی وەردەگیردریّ*) پەیان پێدەبەین. ل٤٣٩)[١].

ئەم جۆرە بڕوایانە لەمەڕ پەی پێبردن، لە سەدەی حەڤدەهەمدا ئاسایی بوون، بـەڵام بەهۆی شـەپۆلێكی ئەزموونگـەرایی، لادرا، تـا كانـت و رۆمانتیكـەكان دووبـارە گیانیان بەبەردا كردەوە[٢]. بۆ نموونە با سەرنج بدەینە رایەكانی **ئا. كـۆلّرِیج** لەمـەر پرۆسە چالاكەكانی لە زەیندا:

---

[١]- **كادۆرس** بە رێبازێكی هاوشێوە بەم دەرئەنجامەی دیـاری ئەقلّگەرایانـە دەگـات، كـە زانسـتی ئێمـە لـە چوارچـێوەی سیسـتمێكی تویژینـەوەیی دا رێكخـراوە و، ئێمـە رێگـەی ئـەو سسـتمەوە (بـە پـەی پێبردنـی سەربەرەوخواری شتەكان دەگەین، ئەو پەی پێبردنەی لە وێناكردنی گشتی زەینەوە سەرچـاوەدەگریّ، نـەك لـە وێناكردنی تاك و لە رێگەی هەستەوە. ل٤٦٧)

[٢]- بۆ بەدواچوون لە بارەی گرینگیی تیوری پەیوەست بە پرۆسەكانی مەعریفـە، لەمـەڕ جوانناسـی قۆنـاغی رۆمانتیزم و شوێنی ئەو لە بۆچوونەكانی پێشوودا، بە تایبەتی بۆچـوونەكانی **فلـۆتین** كە(بەئاشـكرا چـەمكی هەستەكان وەك نیشانە یا هێمایەك كە دەكەوێتە سەر زەین) رەت دەكانەوە و بڕوای وابوو، زەین جۆرێك كردە یا هێزە كە (تاوەتیشكی هەیە و لە شتەكانی دەگریّ)، بڕوانـە ئابرامـاز هـ. س. ل٥٩. وێكچـوونی رایـەكانی كانت و فەلسەفەی ئینگلیزی سەدەی حەڤدەهەم لەم كتێبەی خوارەوەدا كەوتۆتە بەرباس و لێكۆڵینەوە:

Lovejoy, Kant and the English Platonists

**لەو حاڵەتانەدا کە مەعریفەی دراو بەزەین، دەبێتە هۆی بەهێز بوونی ئەو توانایانـەی، کـە مەعریفەی ناوبراو لە ڕێگەی ئەوانەوە دەست دەکەوێ، تەنانەت لە زەینی ئاساییترین بینەر بە دوور نابێ، ئەم کواڵێتییە هەم بۆ توانای زەین و هەم بۆ توانای هەستەکانیش، ڕاستە... لە ڕاستیدا زۆر جێگای سەرسوڕمانە، کە چۆن یەك وێکچوونی گچکە بەسـە بـۆ تێگەیشـتنی دەنگێك، یا وێنەیەك، کاتێك کە دەنگ و وێنە پێشتر ناسراون و لە زەیندا بوونیـان هەیـە، هەروەها زۆر سەیرە کاتێك کە وێنەیەکی ئاوا پێشتر بوونی نەبووە، تەنیا یەك وردە گۆڕانکاری هەموو وێنەکە دەکاتە بولێڵ و نادیار. لە ئاکامدا بە ڕای بیانییەکان ئاوایە، کە ئاخێوەرانی تێکڕای زمانە نەناسراوەکان بە خێراییەکی زۆر دەدوێن و، ئەو کەسانەی تازە دەسـتیان بـە تێگەیشتنیان کردووە، لێکجیانەکردنەوەی چەند بەشێك لە وتەکانیان، گێژیان دەکات[1].**

**ئایا لە سروشت دا، شتەکان بێ هیچ پاڵنەرێك لە لایەن خۆمانەوە بە خۆمـان دەدرێ؟ ئایـا سروشت تێکڕای ئەوانەی لە هەموو بارودۆخێکدا بە تەواوی پێمان دەبەخشێ ، وەك ئەوەیە پێشتر دروستکراون؟ شتێکی ئاوا تەنانەت لە زەینیشدا جێگـای نابێتـەوە... دەبـێ ئێمـە پێشوەخت نموونە یا وێنەیەکی ئەو شتەمان هەبێت کە سەرنجی ئێمەی ڕاکێشاوە...[2]**

دووبارە هامبۆڵت کە ئەم بڕوایانە بە ڕوونی بە تێگەیشتن و لێکدانەوەی گوتـار، گشـتگیر دەکات، (ل٧٠ و ٧١) دەڵێت جیاوازی بنەمای لە نێوان تێگەیشتنی وتـە و تێگەیشـتنی دەنگی ناگوتاری لە ئارادایە (بڕوانە پەراوێزی ل٤٧ ژ١). بـۆ دەنگـی ناگوتـاری (*توانـای هەستە ئاژەڵییەکان*) بەسە، بەڵام بۆ پەی بردن بە وتەی مرۆڤ، تێگەیشـتنی هەمەلایەنـە (*تەنیا بانگەوازی بەرامبەر و بابەتی دەلالەتەکان نییە*). یەکێك لە بەڵگەکان ئەمەیە، کە زاراوە (*وێنەیەك نییە لە خودی شتەکە، بەڵکو وێنەیەکە کە لـە سـەردەمی ئێمـەدا لـە*

---

[1] - وەرگیراوە لە:

A. D. Snyder, Coleridge on Logic and Learning, New Haven, Yale University Press (1929) pp133-134

[2] - بگەڕێوە بۆ سەرچاوەی پەراوێزی سەرەوە.

*بارەی دا دروست بووە) (ل٧٤)*. سەڕای ئەوە پەی بردن بە گوتار، پێویستی بە شیکردنەوەی نیشانە وەرگیراوەکانە لەسەر بنەمای توخمە بنەماییەکان، کە رۆڵێکی لە بنەڕەتدا داهێنەرانەیان هەیە لە بەرهەمهێنانی گوتاردا، و لەبەر ئەمە دەزگای بەرهەمهێن کە لە بەرهەمهێنانی گوتاردائەویش رۆلێك دەگێڕێ، ئەکتیڤ دەکات. چونکە تەنیا لەسەر بنەمای یاساگەلی نەگۆڕی ئەم دەزاگایەیە، توخمەکان و پەیوەندییەکانی نێوانیان، دیاری دەکرێ. بەم پێیە دەبێ **یاسای بەرهەمهێنی** ژێرسازیی، لە تێگەیشتنی گوتاردا دەوری هەبێت. ئەگەر بەهۆی زاڵبوون بەسەر ئەم یاسایانەدا و بەهۆی توانای (ئەگەری بە واقع کردن)ی نەبوایە، زەین نەیدەتوانی لەگەڵ میکانیزمی گوتاری بەرهەمهاتوو هەڵس و کەوت بکا، هەروەك چۆن مرۆڤێکی کوێر ناتوانێ هەست بە رەنگەکان بکات. کەواتە دەرئەنجامەکە ئەوەیە، کە هەم میکانیزمی پەی پێبردن و هەم میکانیزمی بەرهەمهێنانی گوتار، دەبێ یاساکانی **ژێرسازی بەرهەمهێن** بەکاربێنن. تەنیا لە رووی یەکسانی واقعی ئەم سیستمە ژێرسازیە لە ئاخێوەر و گوێگردا پەیوەندیی وەدی دێ، بە واتایەکی تر، ئەم سیستەی برهەمهێنی ژێرسازی لە هەموو مرۆڤەکاندا هاوبەشە، و هەر ئەم خاڵەیە کە لە شیکردنەوەی کۆتایی دا بە یەکسان بوونی سروشتی مرۆیی دەگا.

**لە زەینی مرۆڤدا جگە لە چالاکی زەینی شتکی تر نییە، و پەی پێبردن و بەرهەمهێنانی گوتار لە بەروبوومە جۆراوجۆر و فرەلایەنەکانی هێزی زەینی مرۆییە. ناتوانین وتووێژ بە بدە و بستێنەی مادی لەقەڵەم بدەین. دەبێ لە نێوان گوێگر و ئاخێوەردا، بە کەڵك وەرگرتن لە هێزی دەروونی خودی زەین مەبەستی هاوبەش کامڵ ببێ. ئەوەی گوێگر وەریدەگرێ جۆرێك وروژاندنی گونجاو و هاوئاهەنگکراوە...لەم روانگەوە، لە هەر مرۆڤێکدا بە تەواوی بوونی هەیە، ئەمەش لەوە بەولاوە مانایەکی تری نییە، کە هەرکەسێك بە هۆی هێزێکی دیاری کراو، بگۆڕ، کاریگەر و سنووردانەر دەست بە هەوڵێکی رێك و پێك دەکات. دەتوانین تێبگەین**

**زمان هەمووی، چ لە رووی دەروونیـــەوە چ لــە رووی دەرەکییـــەوە بەرەبــەرە لــە درەوونــەوە سەرهەڵدەدا و هەنگاو بە هەنگاو لە دەروونی خۆیەوە پەیدا دەبێ.**
**هەروەك زانیمان، تێگەیشتن ناتوانێ لە سەر بنەمای کردەوەیەکی دەروونی دابمەزرێ، کە لــە لایەن خودی ئێمەوە ئەنجام دەدرێ و، ئاخاوتن لەگەڵ یەکتر دەبێ شتێك بێ لە وروژاندنی هێزە ئاخاوتنی گوێگر بەولاوەتر، ئەگەر لەو جیاوازییەی کە لە نێوهن تاك تاکی مرۆڤەکاندا هەیە، یەك سروشتی مرۆیی بوونی نەبێ، کە بەتەواوی خۆی وەك تاکی تاکی لێکجیا دەربخات.**

تەنانەت لەمــەڕ پــەی پێبردنــی تاکــە زاراوەیــەکیش، دەبــێ سیســتمی یاســاکانی **ژێرسازی بەرهەمهێن**، چالاك بکرێ. بە بڕوای **هامبۆڵت** ئەم گریمانەیە کە ئاخێوەر و بەروتە (**مخاطـب**) گەنجینەیەك چەمکی هەوێنکرا و دیاریکراو و هاوبەشیان هەیە، راست نییە، بەڵکو دەنگە وەرگیراوەکان زەین دەجــولێنن، تابەکــەڵك وەرگــرتن لــە ئامرازەکانی خۆی، بۆ ئەو مەبەست چەمکێکی تایبەت بەرهەمبێنێ:

**لەیەکتر گەیشتنی مرۆڤەکان لەبەر ئەوە نییە، کە هەریەکیان نیشانەگەلی شتەکانی تر دەخاتە روو، بەم بەڵگەیەش نییە کە ئەوان شتێك بۆ یەکتری دیاری دەکەن تا تێگەیشتنێکی ورد و تەواو رابگەیەنن. لێکتێگەیشتنی مرۆڤەکان لەبەر ئەوەیە کە ئەوانە هەریەکەیان ئەنــدامی زنجیرەیەك وێنای هەستەکانی یەکترین و پشتبەست بە هێزی بەرهەمهێنی چەمکی دەروونی خۆیانن. بە لێکدانەوەیەکی تر، ئامرازی پەیوەندی هەریەکێکیان، چەندین چەمکی گونجــاو لەگەڵ یەکتری نەك بەیەك چەمك، دەخولقێنێ. (ل٢١٣)**

کورتەی وتە ئەوەیە کە تێگەیشتنی گوتار، پێویستی بە بەرهەمهێنانی دەروونی و رەنگدانەوەی نیشانە، هەروەها ناوەرۆکی مانایی هەیە.

سەرنجی توێژەرانی هاوچەرخ لەمەر پەیی پێبردن، رووی لە رۆڵی نموونەکانی دووبارە دەرکەوتەی[١] دەروونییە، و هەوڵدەدەن ئەم خاڵە بە درێــژی روون بکەنــەوە، کــە لــە تێگەیشــتن یــا پــەی پێبردنــدا، تــەنیا کۆمەڵــە نموونەیــەك بەشــدار نییــە، بــەڵکو سیســتمێکی رێســا نــەگۆڕەکانی بەرهــەمهێنانی ئــەم نموونانــە بەشــدارە[٢]. لــەم زەمینەشدا دەتوانین ئەم توێژینەوانە، بە درێژەپێدانی نەریتی زماننناسی دیکارتی و دەروونناسی ژێرخانی ئەو زماننناسییە بزانین.

---

[١]- بۆ نموونە بڕوانە:

D. M. Mac Kay "Mindilk Behavior in Artefacts" British Journal for Philosophy of Science, vol. 2 (1951), pp. 105-121 J. S. Bruner, "On Perceptual Readiness" Phycological Review, vol. 64 (1957) pp. 123-152, "Neural Mechanisms in Perception", Psychological Review, vol, 64 (1957) pp. 340-358

بۆ کورتەیەك دەربارەی پرۆسە ناوەندییەکانی تێگەیشتن، بڕوانە:

H. L. Teuber, "Preception in the Handbook of Physiology-Neurophysiology, III, J. Field, H. W. Mogoun, V. E. Hall (eds), American Physiological Society, Washington, D. C. (1960) Chap. LXV

[٢]- بۆ بە دواداچوونی پتر و سەرچاوە لە بواری مۆرفۆلۆجی دا بڕوانە:

M. Halle & K. N Stevens, "Speech Recognition: A Model and a Programe for Resarch" in fodor & Katz (ed), op. cit. and G A. Miller & N. Chomsky, "Finitary Models of Language Users" Part 2, in R. D. Luce, R. Bush, & e. Galanter (eds), Handbook of Mathmatical Psychology, vol II, New York, Wiley (1963)

# دەرئەنجام

بە پێی وتەی وایتهید، کە ئەم کتێبەمان بە وتەی ئەو دەسپێکرد، وادێتە بەرچاو، زمانناسی دیکارتی و دەروناسی مەعریفی، دوای وەستانێکی دوور و درێژ، رووی سەرنجی کردۆتە میتۆدەکانی لێکدانەوەی پێکهاتەی زمان و پرۆسە زەینییەکان، واتە ئەو رایانەی تا رادەیەك رەگ و ریشەیان لە (سەدەی بلیمەتان) دا هەیە و لەو قۆناغە دا ئەو بایەخەیان پەیدا کرد، تا سەدەی نۆزدەهەم گۆڕانکارییەکی پڕ بەرهەمیان تێپەڕاند. لایەنی داهێنەرانەی کەڵك وەرگرتن لە زمان، جارێکی تر وەك خاڵێکی سەرەکی سەرنجی زمانناسانی بۆ لای خۆی راکێشا. تیورییەکانی **دەستووری هاوبەشی گشتی**، کە لە سەدەی حەڤدە و هەژدە دا خرایە روو، جارێکی تر لە **تیوری دەستووری گەردانکردنی بەرهەمهێن** دا گیانی بەبەرداکرایەوە و کەوتە بەرباس و لێکۆڵینەوە. دەسپێکردنەوەی لێکۆڵینەوەکان لە بارەی هەل و مەرجی سیمای گشتی لە سیستمی رێساکانی زمانیی دا، ئێستا جارێکی تر، هەولێ گەیشتن بە روونکردنەوەی قووڵتری ئەم دیاردەیە، کە لە زمانەکانی تردا دۆزراوەتەوە و لە کاریگەری زماندا بەدی دەکرێ، شتێك نییە مەحاڵ بێ. توێژینەوە نوێیەکان، لە کۆتایی دا روویان کردە تاوتوێ کردنی ئەو راستییە سادانەی، لەمێژ بوو پشتگوێ خرابوون، ئەو راستییانەی وەك ئەوەی ئاخێوەرێکی زمان، کە شتی زۆر دەزانێ و هەرگیز پێشتر فێریان نەبووە، ناتوانین رەفتاری سروشتی زمانی ئەو، لەسەر بنەمای **کۆنترۆڵی وروژێنەر**، **مەرجدارییی**، **گشتاندن** و **پێوانە**[1]، **نموونەیی**، **خوو**، یا **ئارەزووی کاردانەوە** بە روونی بە شێوەیەکی لۆجیکی

[1]- لەفارسییەکەدا **قیاس** نووسراوە کە بەپێ شوێنی لە رستەکەدا، پێوانە، بەراورد کردن، پێکگرتن، دەگەیەنێ. و/ کوردی

روونبکەینەوە. لە ئاکامدا نەك تەنیا لە بارەی زماندا، بەڵکو لە بارەی پێشمەرجەکانی فێربوونی زمان و، ئەرکی پەی پێبردنی سستمە ئەبستراکتەکانی یاساکانی گشتی، روانگەی نوێ سەریهەڵدا. من هەوڵمداوە لەم تاوتوێکردنە کورتەدا، لەمەڕ زماننامسی دیکارتی و تیوری زەین، کە رەگ و ریشەی لە وێدایە، دەریبخەم زۆربەی ئەو شتانەی ئێمە بە دەرئەنجامی توێژینەوەکانی ئەم دواییەیان دەزانین، لە لێکۆڵینەوەکانی پێشوودا(*کە زۆربەیان لەیادکراون*) ئاماژەیان پێکراوە یا بە روونی پۆلێن کراون.

پێویستە لە بیرمان بێت کە ئەم تاوتوێکردنە زۆر ناتەواوە و لە زۆر لایەنەوە رێ بزرکەرە. هەندێك کەسایەتی گرینگ وەك **کانت**، یا ناوی نەبراوە یا رایەکانیان بە ناتەواوی کەوتۆتە ژێر باس. هەروەها رێکخستنی ئەم تاوتوی کردنەش لادانێکی تەواوی پێوە دیارە: گەڕانەوە بۆ رابردوو، بۆ دۆزینەوەی هۆگرییەکانی هاوچەرخ، لە بری دەربڕینی سیتماتیك ئەو چوارچێوەی کە ئەم رایانەی تێدا دەردەکەوتن و لە شوێنێکی تایبەتی داجێگیر دەبوون. هەر لەم رووەوە، جەخت لەسەر وێکچوونەکان کراوەتەوە و جیاوازیی و لێك دوورکەوتنەوەکان،گوێیان پێنەدراوە. لەگەڵ ئەم حاڵەشدا، بەڕای من تەنانەت تاوتوێکردنێکی ناتەواوی ئاواش نیشانی دەدا، کە دابڕان لە پەرەپێدانی تیوری زمانیی، زۆر زیانبەخش بووە و تاوتوێکردنی وردی تیورییە نەریتییەکانی زمان، وێڕای تیوری پرۆسەکانی زەینی، تاچەند بەنرخ دەبن.

# سەرچاوەکان

Aarslef, H.: "Leibniz on Locke on Language," *American Philosophical Quarterly*, vol.1, no. 3, pp. 1_24, 1964.

Abrams, M. H.: *The Mirror and the Lamp*, Oxford University Press, Fair Lawn, N. J., 1953.

Aristotle: *De Interpretatione.*

____: *De Anima.*

Arnauld, A.: *La Logique, ou l'art de penser*, 1662; trans. J. Dickoff and P. James as *The Art of Thinking*, The Bobbs_Merrill Company, Inc., Indianapolis, 1964.

Bacon, R.: *Grammatica Graeca.*

Bayle, F.: *The General System of the Cartesian Philosophy*, 1669; English trans., 1670.

Bayle, P.: *Historical and Critical Dictionary*, 1697; selections trans. R. H. Popkin, The Bobbs_Merrill Company, Inc., Indianapolis, 1965.

Beauzée, N.: Grammaire générale, ou exposition raisonnée des éléments nécessaires du language, 1767; rev. ed., 1819.

Bentham, J.: *Works*, ed. J. Bowring, Russell and Russell, Inc., New York, 1962.

Berthelot, R.: *Science et philosophie chez Goethe*, F. Alcan, Paris, 1932.

Bloomfield, L.: *Language*, Holt, Rinehart and Winston, Inc., New York, 1933.

Bougeant, Père G. H.: *Amusement philosophique sur le langage des bestes,* 1739.

Brekle, H. E.: "Semiotik und linguistische Semantik in Port_Royal," *Indogermanische Forschungen*, vol. 69, pp. 103_121, 1964.

Brown, R. L.: "Some Sources and Aspects of Wilhelm von Humboldt's Conception of Linguistic Relativity," unpublished doctoral dissertation, University of Illinois, 1964.

Bruner, J. S.: "On Perceptual Readiness," *Psychological Review*, vol. 64, 1957.

Brunot, F.: *Histoire de la langue française*, Librairie Armand Colin, Paris, 1924.

Buffier, C.: *Grammaire française sur un plan nouveau*, 1709.

Cassirer, E.: *The Philosophy of Symbolic Forms*, 1923; English trans., Yale University Press, New Haven, Conn., 1953.

Carmichael, L.: "The Early Growth of Language Capacity in the Individual," in E. H. Lenneberg (ed.), *New Directions in the Study of Language*, The M. I. T. Press, Cambridge, Mass., 1964.

Chomsky, N.: *Syntactic Structures*, Mouton and Co., The Hague, 1957.

——:"Review of B. F. Skinner, 'Verbal Behavior'", *Language*, vol. 35, pp. 26_58, 1959; reprinted in J. A. Fodor and J. J. Katz (eds.), *The Structure of Language*, Prentice_Hall, Inc., Englewood Clifts, N. J., 1964.

——:"Explanatory Models in Linguistics," in E. Nagel et al. (eds.), *Logic, Methodology, and philosophy of Science*, Stanford University Press, Stanford, Calif., 1962.

——:*Current Issues in Linguistic Theory*, Mouton and Co., The Hague, 1964; reprinted in part in fodor and Katz, *The Structure of Language*.

——:*Aspects of the Theory of Syntax*, The M. I. T. Press, Cambridge, Mass., 1965.

Coleridge, S. T.: "Lectures and Notes of 1818," in T. Ashe (ed.), *Lectures and Notes on Shakespeare and Other English Poets*, G. Bell & Sons, Ltd., London, 1893.

Cordemoy, Géraud de: *Discours Physique de la Parole*, 1666; 2d ed., 1677; English trans., 1668.

Couturat, L., and L. Leau: *Histoire de la langue universelle*, Paris, 1903.

Cowan, M.: *Humanist without Portfolio*, Wayne State University Press, Detroit, 1963.

Cudworth, R.: *Treatise Concerning Eternal and Immutable Morality*, American ed. of *Works*, ed. T. Birch, 1838.

D'Alembert, J.: *Éloge de du Marsais*.

Descartes, R.: *The Philosophical Works of Descartes*, trans. E. S. Haldane and G. R. T. Ross, Dover Publications, Inc., New York, 1955.

——:"Correspondence," trans. L. C. Rosenfield (L. Cohen), *Annals of Science*, vol., I, no. 1, 1936.

——:"Correspondence," trans. H. A. P. Torrey, *The Philosophy of Descartes*, Holt, Rinehart and Winston, Inc., New York, 1892.

Diderot, D.: *Lettre sur les sourds et muets*, 1751.

Du Marsais, César Chesneau: *Véritables Principes de la grammaire*, 1729.

——:*Logiques et Principes de Grammaire*, 1769.

Fiesel, E.: *Die Sprachphilosophie der deutschen Romantik*, Verlag Von J. C. B. Mohr, Tübingen, 1927.

Flew, A.: *Introduction to Logic and Language, First Series*, Blackwell, Oxford, 1952.

Fodor, J. A.: "Could Meaning Be an '$r_m$'?" *Journal of Verbal hearning and Verbal Behavior*, vol. 4, pp. 73_81, 1965.

——:*Psychological Explanation*, chap. *1*, "Is Psychology Possible?" Random House,

Inc., New York, Forthcoming.

____: and J. J. Katz: *The Structure of Language: Readings in the Philosophy of Language*, Prentice_Hall, Inc., Englewood Cliffs, N. J., 1964.

Galileo: *Dialogue on the Great World Systems*, 1630; The University of Chicago Press, Chicago, 1953.

Grammont, M.: "Review of A. Gregoire, 'Petit traité de linguistique,'" *Revue des langues romanes*, vol. 60, 1920.

____: *Traité de phonétique*, Librairie Delagrave, Paris, 1933.

Gunderson, K.: "Descartes, La Mettrie, Language and Machines," *Philosophy*, vol. 39, 1964.

Gysi, L.: *Platonism and Cartesianism in the Philosophy of Ralph Cudworth*, Verlag Herbert Lang and Cie., Bern, 1962.

Halle, M., and K. N. Stevens: "Speech Recognition: A Model and a Program for Research," in Fodor and Katz, *Structure of Language*.

Harnois, G.: "Les théories du langage en France de 1660 à 1821," *Études Francaises*, vol. 17, 1929.

Harris, J.: *Works*, ed. Earl of Malmesbury, London, 1801.

Harris, Z. S.: "Co_occurrence and Transformation in Linguistic Structure," *Language*, vol. 33, pp. 283_340, 1957; reprinted in fodor and Katz, *Structure of Language*.

Herbert of Cherbury: *De Veritate*, 1624; trans. M. H. Carré, University of Bristol Studies No. 6, 1937.

Herder, J. G.: *Abhandlung über den Ursprung der. Sprache*, 1772; reprinted in part in E. Heintel (ed.), *Herder's Sprachphilosophie*, Felix Meiner Verlag, Hamburg, 1960.

____: *Ideen Zur Philosophie der Geschichte der Menschheit*, 1784_1785.

Hockett, C. F.: *A Course in Modern Linguistics*, The MacMillan Company, New York, 1958.

Huarte, J.: *Examen de Ingenios*, 1575; English trans. Bellamy, 1698.

Humboldt, Wilhelm von: *Ideen zu einem Versuch die Grenzen der Wirksamkeit des staats zu bestimmen*, 1792; trans. in part in Cowan, *Humanist without Portfolio*, pp. 37_64.

____: *Über die Verschiedenheit des Menschlichen Sprachbaues*, 1836; facsimile ed., F. Dümmlers Verlag, Bonn, 1960.

Jespersen, O.: *The Philosophy of Grammar*, George Allen & Unwin, Ltd., London, 1924.

Joos, M. (ed.): *Readings in Linguistics*, ACLS, Washington, 1957.

Katz, J. J.: "Mentalism in Linguistics," *Language*, vol. 40, pp. 124_137, 1964.

____: *Philosophy of Language*, Harper & Row, Publishers, Incorporated, New York, 1965.

____: and P. M. Postal: *An Integrated Theory of Linguistic Description*, The M. I. T. Press, Cambridge, Mass., 1964.

Kirkinen, H.: "Les origines de la conception moderne de l'homme_ machine," *Annales Academiae Scientiarum Fennicae*, Helsinki, 1961.

Kretzmann, N.: "History of Semantics," in P. Edwards (ed.), *Encyclopedia of Philosophy*, forthcoming.

La Mettrie, J. O. de: *L'Homme_ Machine*, 1747; critical edition, A. Vartanian (ed.), Princeton University Press, Princeton, N. J., 1960; trans. *as Man a Machine*, The Open Court Publishing Company, La Salle, III, 1912.

Lamprecht, S. P.: "The Role Of Descartes in Seventeenth_century England," *Studies in the History of Ideas*, vol. III, ed. Department of Philosophy, Columbia University, Columbia University Press, New York, 1932.

Lamy, B.: *De l'Art de Parler*, 1676.

Lancelot, C., and A. Arnauld: *Grammaire général et raisonnée*, 1660.

Lees, R. B.: *Grammar of English Nominalizations*, Mouton and Co., the Hague, 1960.

Leibniz, G. W. von: *Discourse on Metaphysics*, English trans. G. R. Montgomery, The Open Court Publishing Company, La Salle, Ill , 1902.

____: *Nouveaux essais sur l'entendement humain*, trans. A. G. Lang_ley, The Open Court Publishing Company, La Salle, III, 1949.

Leitzmann, A. (ed.): *Briefwechsel zwischen W. von Humboldt und A. W. Schlegel*, 1908.

Lenneberg, E. H.: "A Biological Perspective of Language," in E. H. Lenneberg (ed.), *New Directions in the Study of Language*, The M. I. T. Press, Cambridge, Mass., 1964.

____: *The Biological Bases for Language*, John Wiley & Sons, Inc., New York, forthcoming.

Livet, Ch._L.: *La grammaire française et les grammariens du XV Ie siècle*, Paris, 1859.

Lovejoy, A. O.: "Kant and the English Platonists," in *Essays Philosophical and Psychological in Honor of William James*, Longmans, Green & Co., Inc., New York, 1908.

____: *The Great Chain of Being*, Harper & Row, Publishers, Incorporated, New York, 1936.

Lyons, G.: *L'idéalisme en Angleterre au XVIIIe siècle*, Paris, 1888.

Mackay, D. M.: "Mindlike Behavior in Artefacts," *British Journal for Philosophy of Science*, vol. II, 1951.

Magnus R.: *Goethe als Naturforscher*, Barth, Leipzig, 1906; trans. H. Norden, Abelard_Schuman, Limited, New York, 1949.
Marx, K.: *Critique of the Gotha Program*, 1875.
____: *Economic and Philosophic Manuscripts*, 1844; trans. T. B. Bottomore, in E. Fromm (ed.), *Marx's Concept of Man*, Ungar, New York, 1961.
McIntosh, Margaret M. C.: "The Phonetic and Linguistic Theory of the Royal Society
School," unpublished bachelor of letters thesis, Oxfored University, 1956.
Mendelsohn, E.: "The Biological Sciences in the Nineteenth Century: Some Problems and Sources," *History of Science*, vol. III, 1964.
Mill, J. S.: *Rectorial Address at St. Andrews*, 1867.
Miller, G. A., and N. Chomsky: "Finitary Models of Language Users," in R. D. Luce et al. (eds.), *Handbook of Mathematical Psychology*, John Wiley & Sons, Inc., New York, 1963, vol. II.
Passmore, J.: *Ralph Cudworth*, Cambridge University Press, New York, 1951.
Postal, P. M.: *Constituent Structure*, Mouton and Co., The Hague, 1964.
____: "Underlying and Superficial Linguistic Structures," *Harvard Educational Review*, vol. 34, 1964.
Proudhon, P._J.: *Correspondance*, ed. J._A. Langlois, Librairie Internationale, Paris, 1875.
Quine, W. V. O.: *Word and Object*, John Wiley & Sons, Inc., New York, and The M. I. T. Press, Cambridge, Mass., 1960.
Reid, Thomas: *Essays on the Intellectual Powers of Man*, 1785.
Robinet, J. B.: *De la Nature*, 1761_1768.
Rocker, R.: *Nationalism and Culture*, trans. R. E. Chase, Freedom Press, London, 1937.
Rosenfield, L. C.: *From Beast_Machine to Man_Machine*, Oxford University Press, Fair Lawn, N. J., 1941.
Rousseau, Jean_Jacques: *Discourse on the Origins and Foundations of Inequality among Men*, 1755; trans. in R. D. Masters (ed.), *The first and Second Discourses*, St Martin's Press, Inc., New York, 1964.
Ryle, G.: *The Concept of Mind*, Hutchinson & Co. (Publishers), Ltd., London, 1949.
Sahlin, Gunvor: *César Chesneau du Marsais et son rôle dans l'évolution de la Grammaire général*, Presses_Universitaires, Paris, 1928.
Sainte_Beuve, Ch._A.: Port Royal, vol. III, 2d ed., Paris, 1860.
Schlegel, August Wilhelm: "Briefe über Poesie, Silbenmass und Sprache," 1795; in *kritische Schriften und Briefe*, vol. I, *Sprache und Poetik*, W. Kohlhammer Verlag,

Stuttgart, 1962.

____: *Kritische Schriften und Briefe*, vol. II, *Die Kunstlehre*, 1801, W. Kohlhammer Verlag, Stuttgart, 1963.

____: *Lectures on Dramatic Art and Literature*, 1808; trans. John Black, G. Bell & Sons, Ltd. London, 1892.

____: "De l'étymologie en général," in E. Böching (ed.), *Oeuvres Écrites en Français*, Leipzig, 1846.

Schlegel, Friedrich von: *Geschichte der alten und neuen Literatur*, 1812.

Skinner, B. F.: *Verbal Behavior*, Appleton_Century_Crofts, Inc., New York, 1957.

Smith, Adam: *Considerations Concerning the First Formation of Languages, The Philological Miscellany*, vol. I, 1761.

Snyder, A. D.: *Coleridge on Logic and Learning*, Yale University Press, New Haven, Conn., 1929.

Steinthal, H.: *Grammatik, Logik und Psychologie,* Berlin, 1855.

____: *Gedächtnissrede auf Humboldt an seinem hundertjahrigen Geburtstage*, Berlin, 1867.

Teuber, H. L.: "Perception," in J. Field et al. (eds.), *Handbook of Physiology _ Neurophysiology*, American Physiological Society, Washington, D. C., 1960, vol. III.

Troubetzkoy, N. S.: "La phonologie actuelle," *Psychologie de langage*, Paris, 1933.

Vaugelas, Claude Favre de: *Remarques sur la langue françoise*, 1647.

Veitch, J.: *The Method, Meditations and Selections from the Principles of Descartes*, William Blackwood & Sons, Ltd., Edinburgh, 1880.

Wellek, R.: *Kant in England*, Princeton University Press, Princeton, N. J., 1931.

Whitehead, A. N.: *Science and the Modern World*, MacMillan, 1925.

Whitney, W. D.: "Steinthal and the Psychological Theory of Language," *North American Review*, 1872; reprinted in *Oriental and Linguistic Studies*, Scribner, Armstrong and Co., New York, 1874.

Wilkins, John: *an Essay towards a Real Character and a Philosophical Understanding*, 1668.

Wittgenstein, L.: *Tractatus Logico_Philosophicus, 1922*; New trans. D. F. Pears and B. F. McGuiness, Routledge & Kegan Paul, Ltd., London, 1961.

____: *Blue and Brown Books*, Harper & Row, Publishers, Incor_porated, New York, 1958.